

## شیعر

کارین بۆیێ

ئیسماعیل حەمەئەمین

غەمگین بۆڵی

## چیرۆك

مـەحمود نەجمەدین

میران ئابراهام

## لێکۆڵینەوە

بەیان سەلمان

سۆران ئازاد

ئەحمەدی مەلا

# نامە

سێ نامەی شاملوو بۆ ئایدا

# ئەفسانە

باوکە ئاسمان و دایکە زەوی و
منداڵە گێڕەشێوێنەکانیان



تا ئەو کاتەی خوێندنەوە لە کۆمەڵگادا نەبێتە کلتور هیچ ڕۆژنامە و گۆڤار و دەزگایەکی ڕۆشنبیریی ناتوانێت لەسەر داهاتی خۆی بژی و پەرە بە پڕۆژە ڕۆشنبیرییەکانی خۆی بدات. ئێمە لە وڵاتێکدا ئەژین سیحری وشە تابێت بێ بەها ئەکرێت و لەبری وشە و دیالۆگ توندوتیژی ئەخرێتە جێگای، لەم ژینگەیەدا ڕێنادرێت عەقڵ کارەکتەرێکی کارا و بڕیاردەربێت. سەیرکردنی کایەی ئەدەبیش لە ئاستی دەسەڵاتدا هەمیشە وەك کایەیەکی بێ بەها و لاوەکی سەیرکراوە، ئەمە وائەکات پڕۆژەی بە کلتورکردنی خوێندنەوە هێندەی تر پەك بخات و نەهێڵێت لە بری ڕەمزە سیاسییە ناشیرینەکانی ئەدەب و کلتور ببێتە پایەی شانازییەکانی کۆمەڵگا و بەشێکی گرنگ لە شوناسی.
خەونی گۆڤاری ئەدەبی سەردەم کە لە بەهاری ساڵی ٢٠١٣ ـەوە دامەزراوە، کۆکردنەوەی هەرە زۆرترین ژمارەی ئەو نووسەرە جدییانە بوون کە خاوەنی دید و شێوازی نووسینی خۆیانن، لەسەرەتاشەوە ئەوەمان زانیبوو کە تا داستنەدەینە گۆڤارێکی جدی نازانین کە نووسەرە جدییەکانمان چەندە کەمن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵماندا ڕەنگاوڕەنگییەك لە ئاستێکی بەرزدا بدەین بە بەرهەمە بڵاوکراوەکانی ناو گۆڤارەکە. لەپاڵ گرنگیدانمان بە ئاستی تێکستە بڵاوکراوەکانی ناو گۆڤارەکەش هەوڵماندا بەهەمان ئاست گرنگی بە دیزاینی گۆڤارەکە بدەین. ئەدەبی سەردەم هەموو سێ مانگ جارێك لە کاتی خۆیدا بڵاوکراوەتەوە، تا ڕادەیەك خوێنەرانێکی دەستەبژێری لە خۆی کۆکردۆتەوە، بەڵام هێشتا ژمارەی فرۆشی نەگەیشتۆتە ئەو ڕێژەیەی کە گۆڤارەکە بتوانێت بەداهاتی خۆی بژی، دیارە تا ئێستاش هیچ گۆڤارێکی جدی ئەدەبی لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا نەیتوانیوە ئەو خەونە بەدیبهێنێت، هەرە هۆکارە سەرەکیەکەشی ئەوەیە کە خوێندنەوە نەبۆتە کلتور، نەبۆتە پێداویستییەکی گرنگی ژیانی ئینسانی کورد.
لە ژمارە یەکەوە تاکو ژمارە نۆی گۆڤارەکە بە وەرەقە چاپکراوە، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی قەیرانی دارای و سیاسی ناو هەرێم، توانیمان ژمارە دە تەنها لە پەیجی سەردەمدا بڵاوبکەینەوە و بەوەرەقە چاپی نەکەین، هەروەها نیوەی پاداشتەکانیش بدەین بە نووسەرە بەشدارەکانی. ژمارە یانزەی ئەدەبی سەردەم کە ئەم ژمارەیەی بەردەستانە،

نەمانتوانی بە وەرەقە چاپی بکەین، ناچار تەنها لە پەیجی سەردەمدا بڵاوی ئەکەینەوە، بۆ لەوەش بەداوای لێبوردنەوە نەمانتوانی هیچ پاداشتێك بە نووسەرە بەشداربووەکانی بدەین.

کاتێك ئەم دێڕانە ئەنووسم وەك نووسەرێکی کورد شەرم ئەکەم لە وڵاتێکدا ئەژیم کە پڕە لە ئیدیعائاتی سیاسی گەورە و کەچی من وەك سەرنووسەری گۆڤارەکە ناتوانم پارەی چاپی گۆڤارەکە هەم لە دەزگای سەردەم وەربگرم کە زیاد لە ساڵ و نیوێکە منحەی مانگانەی وەرنەگرتووە، هەمیش سپۆنسەرێکی بۆ پەیدابکەم. ئەم شکستە بۆ کۆتایی و سیزیفیەتەی ناو دنیای گۆڤارە کوردییەکان هێندەی غەمی ئینسانی کورد درێژ و جدییە، بەردەوام لەناو ئەم دنیا بە سیاسیکراوەی کوردیدا، لە ناو ئەم فەشەلە یەك بەدوای یەکانەی بەڕێوەبردنی وڵاتدا کە تەنها کانگای خەیاڵی موئامارەچێتی و تیرۆری جەستەی و مەعنەوییە، چیتر ئەدەب ناتوانێت گەشەی سروشتی خۆی بکات.

ناکرێت گۆڤارێك تەنها لە پەیجەکاندا دابنرێت و نەتوانێت پاداشتی نووسەرەکانی بدات و بەردەوام بێت، ئەم بێ ئومێدییە تەنها لەو کۆمەڵگایانەدا بوونی هەیە کە خاوەنی هیچ تروسکەیەك نین بۆ دوارۆژ، کۆمەڵگایەکن کە تەنها لە خەرابات و داڕمانی بەردەوام و جەهلی بەردەوامدا لەگەڵ ئەو سیاسیانەدا ئەژین کە جگە لە ماڵوێرانی هیچ مژدەیەکی تریان پێ نییە.

لەبەر ئەو هەموو هۆکارە غەمهێنەرانە بەباشمان زانی لە دوای ئەم ژمارەیەوە گۆڤاری ئەدەبی سەردەم بە شێوەیەکی کاتی ڕابوەستێنرێت، تا ئەو دەمەی لە ڕووی مادییەوە گرێنگتی بەردەوامی و مانەوەی گۆڤارەکە مسۆگەر ئەکەین؛ ئەگەرچی من بەش بەحاڵی خۆم زۆر ڕەشبینم و پێموایە ئێمە ئێستا لەسەرەتای چوونە ژوورەوەی تونێلێکداین کە کەس نازانێت چەند ئەبات تا لەو سەری تونێلەکەوە دێینەوە دەرەوە.

**هیوا قادر**
**10/10/2015**

# کارین بۆیێ

**1900 ـ 1941**

**لە ماڵی ئێمەوە بەڕاستە شەقامێکدا گەر نزیکەی ٧٠٠م، کەم یان زیاد، بەرە و شار بڕۆیت، بە دەستی ڕاستدا، دەگەیتە شەقامی ڤاسا: "ڤاسا-گاتان"، ناوجەرگەی شاری "یۆتۆبۆری" و یەکێك لە شەقامە پانوپۆڕ و ناودارەکانی شار کە لە چەرخی هەژدەدا لەلایەن ئارشیتێکتکاری هۆڵەندیانەوە دروستکراوە. خێزانی کارین بۆیێ لە ڤاسا ـ پلاتسن ژمارە ١١ ، کە دەکاتە نێوەڕاستی ئەو شەقامە، سەرەتا ژیاون. باب: فریتز بۆیێ، دایك: سیگنێ بۆیێ بە رەچەڵەك ئاڵمانین. کارین ـ ی کچیان و یەکەم منداڵیان لە ٢٦ ئۆکتۆبەری**

١٩٠٠ هاتۆتە دونیاوە. ١٩٢٦ بەکالیۆریۆسی لە زانستی پەروەردەدا هێناوە، ١٩٢٨ ماستەر، لە زانکۆی ئۆپسالا. شەوی ٢٤ ئاپڕیلی ١٩٤١ لە شارۆچکەی ئالینگسۆز، کەمتر لە ٥٠کم لە دەرەوەی یۆتۆبۆری خۆی دەکوژێت.

بۆیێ هەر زوو دەست بە نووسین دەکات و بەرپرسی گەلێ گۆڤار و ڕۆژنامەی ئەدەبی بووە. ڕۆمان و هۆنراوەشی نووسیوە. زیاتر بە شاعیر بە نێوبانگە. هۆنراوەی سادە و ئاسانن، لێ قوڵ و پڕ وردەکاریی فەلسەفی. دەکرێ بگوترێ، تا خوێنەری کورد جوانتر حاڵی بێت، کە ئەو بە رۆحی فروخی فروخزادی فارسان گەلێ نزیکە. ڕەنگە گەر بۆیێ کیژی وڵات و زمانێکی گەورە بایە، ئەوڕۆ بە یەکێك لە نووسەرە جیهانیەکان بناسرابا. زۆربەی هۆنراوەکانی و رۆمانی "کالۆکاین" بۆ زۆر زمانی دونیا وەرگێڕدراون.

لە وەرگێڕانی مندا هەوڵمداوە (کێش و سەروای) هۆنراوەکان، تا ئەوەندەی بکرێ، وەك مەتنە ئەسڵیکە بهێڵمەوە.

وەرگێڕ

# درەخت

کە دەرگاکەم داخراو چراشم کوژایەوە
منیش خۆم لە هەناسەی خۆرنشیندا پێچایەوە
لە دەوروبەرم هەست بە جوڵە دەکەم
جوڵە و کرچەی لق و پەلی درەختێك

لە ژوورەکەم، کە هیچ کەسێکی تری تێدا ناژی
درەختێ سێبەرێکی نەرمونیان، چوون مێرگوزار، رادەخا
درەختێ بێدەنگ، جوان جوان گەورە دەبێ،
هەر وەك ئەوەی بە خەیاڵی کەسێکی نەناسراودا دێ.

هەناسەی رۆحێ، هێزێکی نهێنی
خۆی لە ڕەگوڕیشەی شاراوەی درەختدا، حەشارداوە
من هەندێ جار دەترسم، بە لەرزەوە دەپرسم:
ئەرێ ئێمە دڵنیابین کە هاوڕێیین؟



بەڵام درەخت ئارام دەژی، هێمن هێمن شین دەبێ،
منیش نازانم چی دەوێ، بەرەو کوێ باڵادەگرێ
چقەد دڵگیرە، چقەد ئەفسوناوییە لە نزیك کەسێکەوە بژیت
.کە نەیناسیت

لە دیوانی: وڵاتی شاردراوە ـ وە. "Gömda land"

# کچەشەڕەڤان

خەوم بە شمشێرەوە دی ئەمشەو
خەوم بە شەڕەوە دی ئەمشەو
خەومدی لە تەنیشتەوە دەجەنگام
تەیار، بەهێز و گوڕ ئەمشەو.

دەستت توند چەخماخەی دەدا،
دێوێ لەبەر پێتدا کەوت
پۆلی ئێمە لە ژێر هەڕەشەی کپی تاریکیی
ئاسان یەکیان گرت و گۆرانیان چڕی

به خوێنەوە خەومدی ئەمشەو
به مەرگەوە خەومدی ئەمشەو
خەومدی لە تەنیشتەوە پێکرام
به زەخمی مردنەوە بووم، ئەمشەو.

تۆ هیچ هەستت پێ نەکرد من لێدرام
دەمولێوت توند توند نوقاندبوو
به دەستت تۆکمە قەڵغانت گرتبوو
ڕاست لە بەردەمی خۆتەوە
دڕتدەدا بۆ پێشەوە.

خەوم بە ئاگرەوە دی ئەمشەو
خەوم بە گوڵباخەوە دی ئەمشەو
مەرگم هێند جوان و نازدار بوو
من، ئاوا خەوێکم دی ئەمشەو

لە دیوانی: وڵاتی شاراوە
"Gömda land"



کچەشەڕڤان: یان شوێڵدموێ: Sköldmö
خانمانی جەنگاوەر کە لە چاخەکانی کۆندا، پێش زاین، لە وڵاتانی باکور (سکەندەناڤیای ئێستا و هەندێ وڵاتی دەوروبەری) بەشداری جەنگیان کردوە و بە جەنگاوەرانی شەڕ (شۆێڵدموێ) ناسراون.

# تۆ تۆییت!

تۆ تۆویت و من خاکتم
تۆ لە مندایت و شین دەبیت
تۆ ئەو منداڵەی کە چاوەڕوان دەکرێیت
منیش دایکتم

ئەی خاك، گەرمیتی بدەرێ
ئەی خوێن شەربەتتی بدەرێ
ئەمڕۆ هێزێکی نەناسراو موحتاجی
هەموو ژیانی منە.

گەرمە شەپۆلی بەردەوام

هیچ بەربەستێك ناناسێت
دەیەوێت زیاتر بئافرەندێنێت
هەرچی شتیش لەبەردەمیایە
رایبیماڵێت!

هەر بۆیێ لە هەناومدا
ژانێکی هێندە زیندە دەمگرێت
شتێك گەورەدەبێت و لێکم هەڵدەوەشێنێت
خۆشەویستم تەنیا تۆیت!

لە دیوانی "لەبەر خاتری درەخت"
För trädets skull

## شتە بچوکەکان

هەنگاوێکی تر ناتوانیت هەڵبنێییت،
تاقەتت نییە سەرت بەرزبکەیتەوە



لەژێر باری ڕەشی نائومێدیدا چەماویتەوە
سوپاسی شتە بچکۆڵە میهرەبانەکان بکە
ئەوانەی وەك منداڵ دڵت دەدەنەوە:
تۆ سێوێکت لە گیرفاندایە،
لەوێ، لە ماڵێ کتێبێکی حیکایەتت هەیە
شتی بچکوك، بچکوك، لەو دەمەدا بێ قەدرن،
کەچی زیندە دەدرەوشێنەوە
لە ساتەوەختی بێزاریشدا،
خەم ڕەوێنن
چوون ئاهێکت پێ دەبەخشنەوە.

لە دیوانی: "هەور"-ەوە، **"Moln"**

# بێ لانە

لانەی رۆحت لێ بزربێ و دونیا بە دوایا تەی بکەیت
ئەوجاش نەتوانیت سۆراخی هیچ شتێ بکەیت،
وات لێ بێ ئیتر نەزانیت هەقیقەت چییە،

وابزانیت ئیتر مرۆڤ تەنیا لە درۆ دروستکراوەو
دڵت لە خۆت هێڵنجبدا و رقت لە خۆت بێتەوە....
ڕاستە ئەمە کارێکی ئاسانە، زۆر ئاسانە
خەم ئاسانە، لێ شادی سەربەرزە و سەختگیر،
چوون شادی لە گشت شتێك ئاسانترە ئاسانتر.

لێ ئەوەی بۆ ماڵێ دەگەڕێ بۆ خۆی
وا نەزانێ، لە کوێدا بیەوێ دەیدۆزێتەوە.....
ئەو دەبێ بێ ـ لانە مودەتێ عەوداڵ و دەربەدەربێ؛
ئەوەشی لە درۆ دروستکراوەو دەیەوێت چابێتەوە،
دەبێ ڕقی لە خۆی بێتەوە تا ئەو دەمەی
لە هەقیقەتێ، کە خەڵکانی تر پێیان بەخشراوە، فێردەبێ.
ئەوە دێنێ دونیا هێندە مەراقی بۆ بخۆیت؟
ئەی دڵ، راوەستە، تۆ کەمێ سەبرت بێ!

**Moln**

لە دیوانی "هەور"-ەوە



# تۆ پاکترین دڵنەواییت!

پاکترین دڵنەواییم تۆیت،
قایمترین پارێزەرم تۆیت،
باشترین شتێك کە من هەمبێت تۆیت،
چوون هیچ شتێ وەك تۆ ئازارم نادات.

نا، وەك تۆ کوا، هیچ شتێ ئازارم نادات.
تۆ، وەك شەختە و ئاگر، دەمسوتێنیت،
تۆ وەك پەلکە پۆڵایەك رۆحم دەسمیت -
باشترین شتێ من هەمبێت هەر تۆیت.

**Moln**

لە دیوانی "هەور"ەوە



# لەدوورەوە کەنارەکان دەبینم

ئیسماعیل حەمەئەمین

- بێگومان بەهاوڕێکەم  پێشکەشە ...

-١-

لەدوورەوە  کەنارەکان دەبینیم
لەدوورەوە  بەلەمێکی بەجێماو لەنێو لمی کەنار
گیاکەڵەکان، گیا وەحشیەکان،
گژوگیاکان لەنێو هەناویدا هەراشتر بوون لەخۆیان.

لەوێوە دیارە ئاسمان نزم و زۆر نزم
لەوێوە دیارە هەورەکان بەنزمی خۆیان لەشەپۆلەکان دەدەن.
 نەورەسێك لەبەردەمدا دەنیشێتەوە و
 پاشان لەنێو قوڵایی ئاسماندا ونەدەبێت
بۆ کوێ ئەی نەورەس، بۆ کوێ !

لەدوورەوە دەستێك، دەستی ئازیزم ئەو ئافرەتەی ئەشقمە
بەرز لەکەنارێکی دوورەوە بانگمدەکات؛  وەرە بۆئێرە،  وەرە
بۆ ئێرە ئازیزم!
دەستێك لەنێزیك شەپۆلەکاندا بانگمدەکات و



دەترسم شەپۆلەکان لەگەڵ خۆیاندا  بیبەن... نەگەڕێتەوە
خودایە چەندە دەترسم نەگەڕێتەوە،
چەندە دەترسم لەنێو شەپۆلەکاندا ونبێت و نەگەڕێتەوە
چەندە دەترسم لەتەنیایەکانی من بترسێت و نەگەڕێتەوە .

مەترسە لەشەپۆلەکانی من و دەستت هەڵبڕە،
مەترسە لەترسی من کە شەپۆلەکان بتبات.
دەترسم شەپۆلەکان بتبات
دەترسم شەپۆلەکان بۆ دوور بتبات
ئاخر شەپۆلەکانی ئەم ژیانەم زۆری بردوون و نەگەڕانەوە

دەنگێك لەپشتمەوەیە هاوارم بۆ دەکات، دەنگێك لەدەنگی( نالی)
کوڕم دەچێت
کەئاوڕدەدەمەوە کەس نییە، کەس لێرە نییە
کوا نالی ، کوان کوڕەکانم؟
نالی بەئەڵمانی دەڵێت؛ دی تسایت فێرگێت میت دیەر سۆ شنێل



پاپا..سۆ شنێل

کات لەگەڵ تۆدا زۆر خێرا تێپەڕدەبێت بابە...زۆر خێرا!

بەڵام ئەم دەنگەی نالیش دوور زۆر دوور لەگەڵ شەپۆلەکاندا وندەبێت..

کوان ئەو نەورەسانەی تۆزێك لەمەوبەر لەنێو لمی ئەم کەنارەدا

بەدووی مندا دەگەڕان و

منیان نەدەدۆزیەوە،

کوان کوڕەکانم خودایە،

خواد تۆ بۆ هەیت ، تۆ بۆچی هەیت گەر کوڕەکانم بۆ نەهێنتەوە؟

ئەی باوکی من، ئەی خودا ، ئەی خواوەندەکان ، کوان منداڵەکانم؟

ئاوڕدەدەمەوە؛ دەنگی ئەوان ونبوون، لەگەڵ شەپۆلی ئەم کەنارەدا ئەوانیش

ڕۆیشتن و نەگەڕانەوە

شەپۆلەکان بگەڕێنەوە .

شەپۆلەکان بگەڕێنەوە، چ نەبێت دەنگیان، هەناسەیان، خەونەکانیانم بۆ بهێنەوە



ئەی خودا من کوڕی تۆم  کوان منداڵەکانم؟

کوا ئەو کەسەی گووتی؛ وەرە بۆ ئێرە
کوا ئەو دەستەی لەسەر کەنارەکە بەرزبۆوە
کوا ئەو شەپۆلەی  ئەویبرد، بۆ کوێ بردی ...

ـ٢ـ

ڕەشەبای ئەم کەنارە دەنگەکانم  بۆ دێنێت
دەنگی هاوڕێکانم
دەنگی منداڵەکانم
دەنگی کوڕەکانم ژێنوا و نالی
هها..هاهاها...دەنگی هاوڕێ سیاسیەکانم
دوژمنەکانم، دوژمنە ئازیزەکانم
دەنگی دایکم کەدێر زەمانێکە دونیای بۆ تەنیایی من جێهیشتووەو
دەڵێت ؛ خوا ئاگای لێت بێت
خوا ئاگای لێت بێت کوڕە تەنیاکەم



خوا ئاگای لەو دڵەت بێت کوڕم کەهەرگیز گەورە نابێت
خوا ئاگای لێت بێت کەدڵت وەك منداڵێك هەڵدەچێت و
وەك منداڵێك ژیر...ژیردەبێتەوە .
وەك ئەم شەپۆلانە توڕەدەبم و
وەك ئەوانیش دەکشێمەوە نێو لەبیرچوونەوە
وەك ئەوانیش خامۆش، خامۆش دەبمەوە...

وەك منداڵێك بەدونیادا ڕێدەکەم
هەرچەندە چل وهەشت ساڵەم  بەڵام هێشتا
من لەنالی کوڕە نۆساڵانەکەم  منداڵتر  و خەوبینەرترم بەشتە بچوکەکانی ئەم دونیایەوە
دەمەوێت شەوێك لەنێو قاوغی هێلکە شەیتانۆکەیەکدا بخەوم
دەمەوێت وەك کیسەڵێك کە چوومە نێو قاوغەکەمەوە
بیجامەیەکی خەت خەتی شین لەبەر بکەم و ئاسوودەبم لەگەڵ دونیا
گڕوگاڵتر و زویتر و زیزتر و
بەختەوەرتبرم بەدونیا .



هێشتا خەیاڵ  وەك جاران دەمباتەوە،
هێشتا وەك جاران خەیاڵ لەپێش دونیای ڕیاڵە بۆ من
ئاخر من گەورە نابم  دایە گیان
من گەورەنابم
من گەورەنابم و سەیری ئەم شەپۆلانە دەكەم و
دەگریم بۆ تۆ
بۆ دووری تۆ
بۆ تۆ وە منداڵێك لەدوای تۆوە هەموو شتێك كۆتایی پێهات
هەموو شتێك دایە گیان
دونیا و منداڵەكانم و خۆم  و هەموو شتێك...

-٣-

وەك ئەم شەپۆلانە دەترسم ئازیزم لەگەڵ خۆیاندا بتبەن



ئاوەها هەموو شتێك ونبوون، نالیەکەم و ژێنواکەم و خۆم و دونیا
هەموو شتێك  لەگەڵ تۆدا ڕۆیشتن
وەك ئەم شەپۆلانە ڕۆیشتن
وەك ئەم کەنارە جوانە  شەپۆلی ئەم ئۆقیانوسە لەگەڵ خۆیدا بردی.

من چیدی بەردەکانم نابینمەوە،
کە دوای نیوەڕۆ تیشکدانەوەی خۆرمان دەبینی لەسەری بریسکەی دەهات.
چیدی ئەم گوێچکە ماسیانە نابینین
 کەهەناسەی تورەو دەهری لەئاسمان و مرۆڤی بەنێویدا تێپەڕبووە.

گوێت لێیە ئازیز ..
گوێت لەهەناسەی دەهریبوونی دەریا و ئۆقیانوسەکانە
گوێت لەهەنسکی گریانەکانیان بووە وەك من
گوێت لەبەربوونەوەی فرمێسەکەکان بووە وەك من



گوێت لەشەپۆلەکان نەبووە کەشەوانە چاو لێکدەنێم لەسەرمدا شەپۆل دەدەن.

ئاوەها نەورەسەکان لەنگەر دەگرن لەنێو ڕەشەبادا،
لەنێوان هەور و شەپۆلەکان و ڕەشەبادا لەنگەر دەگرن و دەقاژوێنن
دونیا بۆ من نییە نەورەسەکانی هاوڕێم ..
هەرگیز بۆ من نەبووە
بقاژێنن هاوڕێیانم نەورەسەکان ،
چەندە لەتەنیایدا وەك یەکین
بقاژوێین هاوڕێیانم نەورەسەکان
من و ئێوەیەك یەك تەنیاین
تەنیاین ، وەك ئەو شەپۆلانە
وەك یەك لەسەر بەردەکانی ژیان دەشکێنەوە ،
وەك هەناسەکان دێن و دەچن و کۆتاییان نایەت
ئای نەورەسەکان ، شەپۆلەکان چەندە تەنیان



من چەندە تەنیام
جیهان چەندە تەنیایە.

لەدوورەوە خوداوەندەکان و مرۆڤەکان دەبینیم  چەندە تەنیان
چیبکەم بۆیان ئەی نەورەسەکان
چیبکەم بۆ دڵم کەهیجرەتی کردووە بۆ دوور
زۆر دوور و پێدەچێت نەگەڕێتەوە
چیبکەم  بۆیان ئەی بەردەکانی کەنارم
چیبکەم بۆیان ئەی ئاسمانی تەنیام ...
کەنارەکان دوورن ..
بەندەرەکان دوورن
کەنارەکان  دوور ..
زۆر دوور و دوورن ....

لەندەن / **31/8/2015** مای ٢٠١٥



# ژیان نەمردنێکی سەراوبنە

غەمگین بۆڵی

گومانم هەیە لەوەی دەینووسم!
دەنووسم: گومانم هەیە لەوەی دەینووسم.
دەنووسم: ئەرێ بەر لەدایکبوون من لێربوومە!
گومانم هەیە لەوەی:
من مردبم و بە هەڵە بژیم!
گومان زۆر زۆرە
کۆتایی ئەو پەیڤانەش خێر.






بە خۆشی خۆم لە دایك نەبوومە و
پرسیشیان پێ نەکردوومە بۆ ئەو مردنەش
پرسیان پێ نەکردوومە بۆ ناوەکەشم
هەفتەیەك ناوم ( هەینی) بووە.

گومان هەیە و
گومانیش خەریکە مێشکی ناو سەرم بخوات!

بۆچی رۆژی دووشەممە ناوم ( هەینی) بێت؟
بۆچی ژیانم لەناو گیرفانی باوکم بێت؟
بۆچی لەبەر خاتری بەرمیل ،
ئاوی کانییەك وشك بکەم؟
بۆچی بۆچییە؟
بۆ خۆم دەژیم و
مردنیش دەکەمە بۆنەیەکی نانخواردن
بۆ خۆم دەنووسم و
شیعریش دەکەمە خۆمێکی دڵگەورە
من بۆ خۆم:
کەرێکی فەقیرم لە شێرێکی ئازا خۆشتر دەوێت

من بۆ خۆم:
پەیڤی شیعر پڕ دەکەم لە ڕێگەی دڵنەرم
من بۆ خۆم:
گیرفانەکانم پڕ دەکەم لە بەردی دڵگەورە و
ئەو بەردانەشم خۆشتر دەوێن کە بەکەڵکی هاوێشتن نایەن.

من بۆ خۆم:
بەردی بچووکم لە بەردی گەورە خۆشتر دەوێت
چۆلەکەم لە باز خۆشتر دەوێت
گوللەی سپیم لە گوللەی ڕەش خۆشتر دەوێت.

بە قەبری خۆم!
با ئەو سوێندەش لەسەرم قەرز بێت
خۆ قەرز دڵی کەسی بۆگەنی نەکردووە
هاورێکەم تەنیا یەك دڵی نییە بۆ ئازار
کۆتر تەنیا یەك خەیاڵی نییە بۆ فڕین
دڵی دایك هەر چوار لای وەك یەکە
دڵی باوك گەورەترە لە گەردوون.






به قەبری خۆم !
گومان سەری ئەو شیعرەم دەخوات
بە گومانێکی زۆرەوە دەنووسم:
بۆچی گورگ مەڕێکی دووقاچ نەبێت؟
بۆچی باز خەریکی ڕاوکردنی مرۆڤی خراپ نەبێت؟
بۆچی پشتی حوشتر کانی نەبێت؟
بۆچی بێدەنگی فەلسەفەی گوتن نەبێت؟
بۆچی کرم ماڵی لەناو شووتی نەبێت؟
بۆچی مێش کرێچی ناو شەکردان بێت؟
بۆچی پەتاتە لەناو ڕۆندا قسەی نەبێت؟
بۆچی دەسکێك کەرەوز سمێڵێکی دەستکرد نەبێت؟
بۆچی ژیان مردنێکی سەراوبن نەبێت؟

گڵۆپەکان پێدەکەم و
خۆم لە دەرەوەی خۆم پەراوێز دەخەم
بێدەنگی گۆڕستانێکی گەورە دەهێنمە ماڵەوە
گۆڕەکەشم بە باوەش دەخەمە ناو مەرکانی گوڵەکان
ڕۆژی دووشەممە بەناوی (هەینی)م پێدەکەنم و
ناوی خۆم دەخەمە ڕستەیەکی بێماناوە و
لە دەرکەی ئاودەستخانە دەنووسم:

(( ئێرە باشترین شوێنە بۆ بیرکردنەوە)).

من بۆچی لێرە وەك سیسرکە نەژیم؟
ئەرێ ئەوەی دەینووسم کەس نەینووسیوە؟

گومانم زۆرە و
گومان خەریکە مێشکی ناو ژیانم بخوات
ئەو دونیایە مردنێکی سەراوبنە
هیچ شتێکی بە کەیفی من نەبووە
نە ناوەکەم
نە ڕۆژی لە دایکبوونم!
دەمەوێت ڕۆژی مردنم بە دڵی خۆم بێت.



مەحموود نەجمەدین
میران ئابراهام



# چیرۆک ئەدەبی سەردەم

٣٥
ئەدەبی سەردەم

# لەقەناتەوە بۆ قارنێ

## مەحمود نەجمەدین



هەفتەیەکی تەواو بوو بەفر و باران بێوچان ئەباری، سلێمانی بوو بوو بە مەرەزەجاڕ، لافاو هەرچی مقەبا و نایلۆن و ئاغزە جگەرە و پاشەرۆکی سەرشەقام و ناو کۆڵانەکان بوو ڕایماڵی، لەشەوی کۆتایی هەفتەی باران بارینیدا ئاسمان روون بووەوە، وشکە سەرما دەستی پێکرد. بەیانی وەختێ خۆر هەڵهات چواردەوری شار سپی بوو، ئەزمەڕ و پیرەمەگروون

بەفر داپۆشی بوون. شەقام و شۆستەکان وەك بەفرگر بەستبووی، شۆفێرەکان لەترسی خزان زۆر بەهێواشی ترۆمبێلەکانیان دەئاژووت، خەڵکی پیادەڕەویش بەئەسپایی پێیان لەسەر زەوی دائەنا.

ئەو بەیانییە مەریوان وەك هەموو رۆژەکانی دیکە بەرەو زانکۆ ڕۆیشت، لەجادە و بانا زۆر بە ئەسپایی هەنگاوی ئەنا، چاوی بۆ ئەو شوێنانە ئەگێڕا زەوییەکەی نەیبستبێ، وەختێ گەیشتە جادەی قەنات گوێی لەدەنگی کەسێك بوو بانگی ئەکرد (مەریوان مەڕۆ گیان..) لەو ساتەدا ئاوڕی دایەوە و خلیسکا، خلیسکا و بێهۆش کەوت. دووکاندارەکانی ئەو دەوروبەرە لەسەری گردبوونەوە، زۆری نەبرد تیمی فریاکەوتن گەیشتنە سەری و گواستیانەوە بۆ خەستەخانە، پزیشکەکان پشکنینیان بۆ ئەنجام دا، لەبەر ئەوەی ئەنجامی پشکنینەکان دڵخۆشکەر نەبوون، یەکێك لەپزیشکەکان بەئامادەبوونی ئەفسەری لێکۆڵینەوە مۆبایلەکەی لەگیرفانی مەریوان دەرهێنا و گەڕا بەدوای ژمارە تەلەفۆنی باوکی، برایەکی، تا ئاگاداریان بکاتەوە. لەیەکەم ژمارەی تۆمارکراودا نووسرابوو ئامەدی برام. دکتۆرەکە ژمارەکەی وەرگرت و لەمۆبایلەکەی خۆیەوە زەنگی بۆ لێدا. هێندەی پێنەچوو تەواوی بنەماڵەکەی گەیشتنە نەخۆشخانە، مەریوان لەسەر قەروێڵەیەك بێهۆش کەوتبوو. دکتۆرەکان هەر زوو لەهۆش هاتنەوەی مەریوان نائومێد بوون، شەماڵ بۆ چارەسەری مەریوان یەکێك لەموڵکەکانی فرۆشت و بە پارەکەی بۆ نەخۆشخانەکانی ئەوروپای برد، لەم خەستەخانە بۆ ئەو خەستەخانە مەریوانی ئەگێڕا، پزیشکەکانی ئەوروپاش هەمان قسەی پزیشکەکانی کوردستانیان پێوتبوو "مەگەر خۆی هۆشی بێتەوە، ئەگەر بەئاگاش بێتەوە ناچێتەوە دۆخی جاران." شەماڵ بەنائومێدییەوە مەریوانی هێنایەوە.

کات تێدەپەڕی و مەریوان نوقمی دنیای بێهۆشی بوو، وەك نووستوویەك هەناسەی ئەداو هیچی تر، هەندێك جار لەدەنگی تەقینی میزەڵانێك، گاڵەدانی دەرگایەك یان زیادکردنی دەنگی تەلەفزیۆنەکە بۆ چرکەیەك رادەچڵەکی و دەگەڕایەوە دۆخی بێ هۆشی. وەختێ ئامەدی برای ریشە رەقەکەی بۆ ئەتاشی هەندێك جار گوێزانەکە بەر ژێرچەناگەی ئەکەوت دیسانەوە بۆ چرکەیەك رائەچڵەکی. زۆرجار دایکی بەهیوای هۆشهاتنەوە پەرداخێکی شووشەی لەبەردەمیدا ئەکێشا بەزەویدا مەریوان وەك هەموو جارێك رائەچڵەکی و ئەگەڕایەوە دۆخی



بێهۆشییەکەی. مانگ تێپەڕی و بوو بەدوو، بوو بەسێ، مەریوان هەر لەدۆخی بێهۆشیدا بوو. خێزانەکەی وەك مردوویەك خزمەتیان ئەکرد، ئامەد و باوکی ڕیشیان بۆ ئەتاشی و لەسەر تاتەشۆرێك پاڵیان ئەخست و ئەیانشۆرد، بەهرەی خوشکی و دولبەرخانی دایکی خۆاردنیان ورد ئەکرد و ئەیان کرد نێو کەپسولێکەوە یان میوەیان لەعەسارە ئەدا و ئەیان کردە سەرنجەوە و لەگەروویەوە پاڵیان پێوە ئەنا بۆ ناوگەدەی، هەندێك جاریش ئاویان بۆ هەڵدەواسی بەم چەشنە مەریوان لەبێهۆشیدا ژیا و نەمرد.

لەکۆتایی پێنجەمین مانگی بێهۆشییەکەیدا، درەنگانێکی شەو دەنگێك لەگەرووی مەریوانەوە دەرچوو. دولبەر کە بە دیارییەوە خەوی لێ کەوتبوو، ڕاچڵەکی، هاواری کرد "شەماڵ ڕاکە."دولبەر ئەوەندە بەتینوتاو بانگی شەماڵی کرد تەواوی خێزانەکە بەخەبەر هاتنەوە و ڕایانکرد بۆ ژورەکەی مەریوان.

دولبەر: مەریوان قسەی کرد.

شەماڵ دەستی کردە ملی دولبەر و گوتی: خوا یارمەتیمان ئەدات، چاك دەبێتەوە. تۆ ئێستا بڕۆ بخەوە ماندووی من چاودێری ئەکەم.

دولبەر: ناڕۆم.

ئامەدو بەهرە بەڕوخساری خەواڵویانەوە گەڕانەوە بۆ سەر جێگاکانیان و خەوتنەوە. شەماڵیش لەسەر تاکە قەنەفەکەی تەنیشت سیسەمەکەی مەریوان دانیشت و دولبەری لەئامێز گرت و بەدیار مەریوانەوە خەویان لێکەوت.

لەچوارەمین ڕۆژی مانگی شەشەمی بێهۆشییەکەیدا بۆجاری دووەم مەریوان دەنگی هەڵبڕییەوە. عەسرێکی فێنك بوو بەهرە خەریك بوو بەسرنج خواردنی ئەخستە دەمی مەریوانەوە، لەو وەختەدا شەماڵ خۆی کرد بە ژووردا و نووکی سرنجەکە لەگەرووی مەریوان گیربوو، هاوارێکی لێ بەرز بووەوە، شەماڵ و بەهرە حەپەسان. هەمان ڕۆژ بردیانە خەستەخانە و حاڵەتەکەیان بۆ پزیشکەکان باس کرد، دکتۆرەکانیش مەریوانیان خستە ژێر چاودێرییەوە.

لەچوارەمین شەوی مانەوەیدا مەریوان جارێکیتر تەقەلای قسەکردنی دا، درەنگانێکی شەو بوو، ئامەد لەبەر پەنجەرەی



ژورەکە وەستابوو، مەریوان هاواری کرد"خوێنم تیا نەما!!!!."هەرچی نەخۆش بوو لەژوورەکەدا راچڵەکین، ئامەد رایکرد بۆ ژووری پزیشکەکان، هەر زوو ماڵەوەشی ئاگادار کردەوە. ئەو شەوە پزیشکی ئێشگر و خێزانەکەی بەدیارییەوە دانیشتن، دەمەوبەیان یەك دووجار کۆکی وگەرووی کرایەوە، کەوتە قسە: خل خل.. خلیسکام، خلیسکام و کەوتمە نێو گۆمی خوێنەوە. نێو دێ سیخناخ بوو لەپاسدار. لەسەر گردۆڵکەکەوە سەیری نێو ئاواییم دەکرد و دەگریام، نەمدەوێرا بچمەوە نێو دێ و لەحەسرەت دایك و باوکم و شنۆی خوشکم ئۆقرەم لێ بڕابوو، لەسەر تەپۆلکەکەوە سەیری گوندەکەم دەکرد. لەو وەختەیدا گوێم لەدەنگی مەلا ئیسماعیلی سەعادەت پوور بوو، بانگی دەکردم" مەریوان، مەرۆ گیان.."ئیتر خۆشم نەمزانی چۆن خلیسکام و خزامە نێوگۆمی خوێنەوە. قاڕنێ لەخوینی خۆیدا گەوزابوو، مەزرای گوند و باخی ماڵەئاغای نوقمی خوێن بوون. یەك بەرەو گوندی دووئاوان رایدەکرد و یەکی دی لەدووئاوانەوە هەڵدەهات. بۆ هەر لایەك چووبای گوللە بەرەو ڕووت دەهات، هەندێکیان لەنێو مەزرادا کوشت و کۆمەڵێکی دیکە لەبەر دەرکەی ماڵی خۆیان وەبەر دەستڕێژی گوللەدران، گەورە و گچکە، پیر و جەوان، شوان و گاوان هەرچیان بەردەست کەوت کوشتیان. کەللەسەری مەلا ئیسماعیلی سەعادەت پوورم بەدەستی سەرگوردەکەیانەوە بینی زەنگۆڵ زەنگۆڵ خوێنی دەتکایە سەر کتێبی پیرۆز.

لەپاڵ دیواری ماڵی حاجی سمایلی عەزیزیدا خۆم مەڵاس دابوو، دەمویست بەپاڵ دیوارەکاندا خۆم دەرباز بکەم. وەختێ هەستامەوە دەستڕێژێکیان لێکردم و کەوتم، وردە وردە بەری چاوم لێڵ بوو. دەنگی گریان و قیژە و قرمژنی ژێسێ و بیکەیسی سۆفیان و قەلاتان و کەرێزەی راچڵەکاند.

چەکدارەکان دوای قەتڵوعام کردنی خەڵکەکە بۆی دەرچوون، قەدەرێك چاوەڕێم کرد تا دڵنیا بووم لەڕۆشتنیان، ئەوجا بە هەسکە هەسك خۆم گەیاندە سەر جادەی پیرانشار ـ نەغەدە. لە قەراغ جادەکە تاوێك دانیشتم، تا ئەو کاتەی لەدوورەوە ترۆمبێلێکی پەیکانم بەدی کرد، خێرا چوومە نێوەڕاستی جادەکە و دەستم بەرز کردەوە، ترۆمبێلەکە لەبەردەممدا وەستا و شۆفێرەکە گورج دابەزی باوەشی پێدا کردم و خستمیە نێو ترۆمبێلەکەوە و پێی

پێدانا. لەتاو ئازاری برینەکەم ئاگام لەوەی نەبوو گوللەیەك بەر گوڵمەی ڕانی چەپم کەوتبوو، یەکی دیش بەرشانی ڕاستم، خوێن لەبن باڵ و بەلەکمەوە تانێو پێڵاوەکانم ڕۆشتبوو. ئازار بڕستی لێ بڕیبووم. نەمدەزانی شۆفێرەکە بۆ کوێ دەمبات، تا ئەوکاتەی ترۆمبێلەکە وەستا و کابرای شۆفێر گوتی: گەیشتین و لەترۆمبێلەکە دابەزی و خۆی کرد بەماڵێکدا، هێندەی پێنەچوو لەگەڵ ژنێکی بچکۆلانە و مێرمنداڵێکدا گەڕانەوە و بە باوەش بردیانمە ژووری و شۆفێرەکە دیار نەما، مێرمنداڵەکە بەدیارمەوە دانیشت بوو، ژنەکەش لەناو دەرگای ژوورەکەدا وەستابوو، زوو زوو دەیگوت "کاڵاو گیان سەری بکێشە بزانە باوکت بۆ دیار نەبوو، ئەو بەستەزمانە خوێنی تیا نەما." کاڵاو بەڕفانێك دەچوو و بەهەناسە بڕکێوە دەهاتەوەو دەیگوت"ئەسەری نییە دایکە گیان."

وردەوردە ئازارم زۆرتر دەبوو، لەتاو ژانی برینەکەم بەدەستە ساغەکەم قەراغی لبادەکەم دەگوشی. گوێم لەدەنگی ژنەکەبوو گوتی: هۆشەنگ گیان دکتۆر هات؟

شۆفێرەکە بەهەناسەبڕکێوە گوتی: ئەوە هات.

هۆشەنگ تۆپەڵێك پەڕۆی خستە دەمەوەو لەگەڵ ژنەکەدا کەوتن بەسەر دەست و قاچمدا و دکتۆرەکەش قۆڵی لێ هەڵکرد و گوللەکەکانی دەرهێنا. بەڵام چۆن؟ ڕۆحم لە لێواری دەرچووندا بوو، تا ئەو کاتەی بەتەواوی بێهۆش بووم، وەختێ بە هۆش هاتمەوە لەژوورێکی بچوکدا بووم، لەنێو جێگایەکی نەرم، هۆشەنگ و خانەوادەکەی بەدیارمەوە دانیشتبوون.

ئەو ماوەیەی لەو ماڵە بووم وەك کوڕی خۆیان خزمەتیان کردم، سێ ژەمە خواردنیان دەهێنایە بەردەمم. دوای دوو هەفتە تۆزێك باشتر بووم، ویستم بچمە دەرەوە تا سۆراغێکی خانەوادەکەم بکەم، لێ هۆشەنگ نەیهێشت و خۆی ئەو کارەی ئەنجام دا، بەیانییەك ڕۆیشت و نیوەڕۆکەی گەڕایەوە و بە ڕوخسارێکی غەمگینەوە گوتی: پرسیارم بۆ کردووی ئەڵێن لەبیمارستانی نەغەدەن، خەمت نەبێ بەیانی سۆراغیان دەکەمەوە.

باوەڕم بەو قسەیە نەکرد، لێم ڕوون بوو بۆ دڵنەوایی من وا دەڵێ. شەوێ تا درەنگانێ لەژێر بەتانییەکەوە بیرم



لەخێزانەکەم دەکردەوە، لەبێدەنگیی شەودا گوێم لە رازان خانم بوو گوتی "ئەی چارە چییە چۆن پێی دەڵێیت؟."ئیتر دڵنیا بووم خێزانەکەم نەماون، تا بەیانی لەژێر بەتانییەکەوە بەهێمنی گریام. بەیانی لەسەر سفرەی نانخواردن گوتم: کاك هۆشەنگ خێزانەکەم نەماون؟ فرمێسك بەچاوەکانییەوە هاتە خوار و گوتی"ئەی ئێمە چی؟ ئێمە خێزانی تۆین."رازان خانمیش سەری بۆ داوێنی شۆڕ کردبووەوە و دەگریا. بۆ ئەوەی لەوە زیاتر دڵتەنگیان نەکەم دەستی هۆشەنگم ماچ کرد و گوتم ئێوە دایك و باوکی منن.

ماوەیەکم لەماڵی هۆشەنگ بەسەر برد، رۆژێك ئیزنم لێ وەرگرت بڕۆم. بەبیستنی ئەو قسەیە هۆشەنگ دای لەپڕمەی گریان، هەرچۆنێك بوو هێورم کردەوە و تێمگەیاند، کە ناتوانم لەم وڵاتەدا بژیم، ئیدی رازی بوو. بەیانییەکی زوو دەستی رازان خانمم ماچ کرد و باوەشم بەکاژاودا کرد و لەگەڵ هۆشەنگدا بەرەو ناڵۆس رۆیشتین، وا بەنیاز بووین بچین بۆ سەڵماس و مەرەند و لەوێشەوە بۆ پارس ئاباد..تا دەگەینە ئازربایەنجان، وەختێ گەیشتینە "ناڵۆس" گوتم کاك هۆشەنگ پەشیمان بوومەوە، حەز دەکەم بەرەو سنوورێکی تر بڕۆم. هۆشەنگ لەقەراغ جادەکە ترۆمبێلەکەی کوژاندەوە و گوتی"ئێستا کوڕی خۆم بۆ ئەوەندە ئینکاری دەوەرە بەیەکەوە دەژین، نانێك هەبوو دەیخوین و گەر نەشبوو شوکری خودای دەکەین."

دەستیم ماچ کرد و گوتم: وەڵاهی لەم وڵاتە بمێنمەوە شێت دەبم. هۆشەنگ هەنیەی ماچ کردم و گوتی"چۆنت پێخۆشە وا دەکەین." پێچی بەترۆمبێلەکەی کردەوەو گەڕاینەوە بۆ سۆفیان لەوێشەوە چوینە دربکە و بۆ بانگی شێوان گەیشتینە پیرانشار. جامی ترۆمبێلەکەم دادایەوە و هەوایەکم هەڵمژی و گوتم: کاك هۆشەنگ چی بکەین؟ سیگارێکی داگیرساند و گوتی: تۆ خەمی ئەوەی مەخۆ.

هۆشەنگ بردمی بۆ ماڵی هاوڕێیەکی بە نێوی شاپوور. وەك خۆی گوتی"شاپوور دۆستی قەدیمییەتی و بەزم و ڕەزمی زۆریان بە یەکەوە هەبووە."ئەو شەوە لەماڵی شاپوور تا بەرەبەیان قسەمان کرد، شاپوور هەستی بەوە کردبوو بارودۆخەکە باش نییە، دەیویست هۆشەنگ رازی بکات سۆفیان بەجێ بهێڵێ.



هۆشەنگ هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی دەستبەرداری سۆفیان بێت. زوو زوو دەیگوت" بەبێ سۆفیان ناژیم."
شاپوور: هۆشەنگ گیان واز لەو قسانە بێنە، بۆ ماوەیەك وەرە شارەوە و دوایی کە بارودۆخەکە باشبوو بگەڕێوە. من هەست بەمەترسییەکی گەورە دەکەم. ئەوەی لەقارنێ رووی دا سەرەتاکەیەتی.
هۆشەنگ سیگارێکی داگیرساندو دەستێکی بەریشەکەیدا هێنا و گوتی: بەگوێت دەکەم، دێمە ناوشار.
شاپوور ئەوقسەیەی هۆشەنگی زۆر پێخۆش بوو، باوەشیان بەیەکدا کرد و توند یەکیان گوشی، تاوێك پێکەنین و دوایی هەردووکیان تێر گریان. هەستم کرد نێوانی ئەو دوانە سیخناخە بەبیرەوەریی خۆش وناخۆش. شاپوور فرمێسکەکانی سڕییەوە و دەستی خستە سەرشانی من وگوتی: بەیانیش ئەم شێرە کوڕە بەرێ دەکەین. منیش دەستم لەسەر سنگم دانا و سوپاسم کرد.
ئەو شەوە لەماڵی شاپوور خەوتین و بەرەبەیانی دووی خەزەڵوەری ١٣٥٨ی هەتاوی لەسەر سنوور رادەستی پیاوێکیان کردم بە نێوی مستەفای حاجی کەریم، هۆشەنگ مشتێك پارەی پێدام و بە گریانەوە لەیەك جودا بووینەوە. لەگەڵ مستەفادا گوند بە گوند و شار بە شار هاتین تا گەیشتینە سلێمانی.
لە سلێمانیش هەر بەهۆی شاپوورەوە مستەفا بردمییە لای پیاوێکی دەوڵەمەند، ئەو پیاوە حاجی جەلالی عەلاف بوو، دۆستی دێرینی شاپوور بوو. ئیدی ئاوها ژیام، ساڵانێکی زۆرە لە لای حاجی جەلال کار دەکەم..ئیتر تاقەتی ئەم شارەم نەماوە دەڕۆم، دەگەڕێمەوە، بیری هۆشەنگ و رازان خانم دەکەم. بیری قارنێ دەکەم دەڕۆم، دەڕۆم...". مەریوان پڕ بە خەستەخانەکە هاواری ئەکرد و ئەیوت لێم گەڕێن با بڕۆم.. شەماڵ و ئامەد و یەکێك لەپزیشکەکان گرتبوویان و ئەویش خۆی رائەپسکاند و هاواری ئەکرد لێم گەڕین بابڕۆم.. دولبەر و بەهرە ئەگریان. مەریوان بەردەوام بوو لەسەر هاوار کردن، تەقەلای ئەکرد لەدەستیان دەرباز بێت، تا ئەو کاتەی یەکێك لەپزیشکەکان دەرزییەکی لێدا، بێ هۆش بوو، ئەوجا ڕەوانەی نەخۆشخانەی سۆزی دەرونییان کرد.



# ژانی گەل

میران ئابراهام



## دیمەنێك لە ڕۆمانی (منداڵە ونبووەکانی گەل)

سابات، لەسەر قەنەفەیەکی درێژکۆلەی سێ نەفەری لە هۆڵکە دانیشتبوو، سەری بەسەر قولاپ و شلیلەکەی دەستیدا شۆڕکردبۆوە، چەندین گلۆڵە شلیلەی ڕەنگاوڕەنگیش لە سەرکۆش و لە چواردەوری بوون، سارا بەرانبەر

ساباتی دایکی لە سوچێکی هەمان قەنەفە چوارمشقی دانیشتبوو، دەفتەرێکی لەناو دەستبوو بۆ سابات ـ ی دایکی دەخوێندەوە، هێواش و ڕستە بە ڕستە ماناکانی بۆ شیدەکردەوە، جار جار هەڵوێستەی دەکرد و لە دایکی دەڕوانی و ناوی شوێن و ڕووداوەکانی بۆ باس دەکرد، ئەو دەفتەرەی کە بەدزییەوە لە سندوقەکەی باپیرە خایم ـ دا دەری هێنابوو... ڕەشنووسی ڕۆمانێکی هاوڕێیەکی باپیرە خایم بوو، چەندین ساڵ بوو نوسیبووی و هێشتا بە چاپی نەگەیاندبوو، دابووی بە خایم تاکو بیخوێنێتەوە، ئەو دەم سارا لە پۆلی چواری ئامادەیی بوو لە قوتابخانەی گۆیژەی کچان، سارا کچێکی باریکەلەی دەمووچاو ڕێکی پرچ ڕەش و لول، چاوەکانی بایەمی و ڕەنگی ڕەش و قاوەیی تێکەڵ و تارماییەکی ڕەساسیش بەسەر بیلبیلەکانی چاویدا ڕژابوون، دەنگێکی ناسك و پێکەنێکی شەرمنانەی پێوەبوو، خوێنی گەرمی لاوێتی بەردەوام بە دەمارەکانیدا شەپۆلیان دەدا و گورج و گۆڵییەکیان بە جەستەی بەخشیبوو.

ـ 'ئەترسم لە ئەنجامدا تەنها دڵشکاویت بۆ بمێنێتەوە و نەگەیت بە مەرامی خۆت؟'

سابات لەکاتێکدا ئەمەی لەبن لێوەوە گوت، کە سارا لە گەرمەی خوێندنەوەدا بوو، سارا هەڵوێتستەکی کردو بەسەرسامییەوە لە دایکی ڕووانی:

ـ 'وامزانی تۆ باوەڕێکی یەقینت بە خۆشەویستیەکەی من و سالار هەیە و هەردەم پشت گیریمان دەکەیت؟!'

سابات، بێ ئەوەی لە سارا بڕوانێت... هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و لەبەر خۆیەوە گوتی:

ـ 'بریا من هەموو شتێکم بەدەست بووایە، لەگەڵ ئەوەدا کە منیش بیر و باوەڕی سالار ـ م لا قبوڵ نییە، بەینی خۆمان بێت و لای کەس لە دەمت دەرنەچێت... باوکت دەیەوێت بە هەرشێوەیەك بووە لێرە بڕۆین و بگەڕێینەوە بۆ ئیسرائیل!'

- 'بگەڕێینەوە بۆ ئیسرائیل؟! بگەڕێینەوە... بگەڕێینەوە... وەکو ئێمە هەفیتەیەك پێش ئەمڕۆ هاتبینەتە ئەم شار و وڵاتە، ئێمە سەد پشتمان لەم وڵاتەدا ژیاوە... ئایا ئێوە ئەوە دەزانن کە بۆ سێ هەزار ساڵ دەچێت ئێمە لەم وڵاتەداین، بۆ زانیاریت من



زیاتر خۆم بە کورد دەزانم وەی لەوەی زایۆنیستێکبم.'
ـ 'هەمووی خۆ هەڵخەڵەتاندنە، ئێمە لەم وڵاتەدا هیچ ئازادییەکمان نییە، تاکەی خۆمان بشارینەوە و لەسەر تەسکەرەکانمان ناو و ناونیشانی هەڵە نوسرابێت کە ئێمە ئیسلامین.'
ـ 'من تێناگەم مەبەستی ئێوە چییە لەو قسانە... بیر و باوەڕی چی و شتی چی؟'
ـ 'خۆتم لێ گێل مەکە، یان باپیرەت و سالار مێشکی تۆشیان تێکداوە، ئەی نازانیت لەسەر چی سالار دایم ناکۆکە و لەگەڵ باوکت و مەحموودی براتدا شەڕییەتی؟!'
ـ 'ئاخ دایە خۆزگە ئیوە تۆزێك بەسەر خۆتاندا دەچوونەوە!'
ـ 'بەخوا جوانە... ئەی ئەوە بێئەقڵی نییە بۆ سالار کە پشتی لە دین و ڕەچەڵەکی خۆی کردووە و بووە بە کۆمەنیست؟!'
ـ 'دایە، سالار هۆشیارە و ئیدی ناتوانێت کوێرانە ئەو بیر و باوەڕەی باو و باپیرانی بەوجۆرە قبوڵ بێت، باوەڕناکەم ئەو نەهی لە سەجەرە و باو و باپیرانی خۆی بکات، بەڵام ئەو دەڵێت ئێمە پێش ئەوەی هەڵگری هەرچ دیانەت یان پرەنسیپێك بین پێویستە خۆمان بە کورد بزانین.'
ـ 'کوڕە بە خوا ئێوە... باوەڕتان هەبێت یان نەبێت، خۆشیتان بێت و تاڵیتان بێت هەر جولەکەن، ئیتر ئەو کەرێتییەتان لە چییە؟!'
ـ 'تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام ئێمە کوردێکی جولەکەین و کوردستان نیشتیمانی ئێمەیە نەك ئیسرائیل، ئێمە لە دایك و باوکێکی جولەکە مەزهەب لەدایك بووین و لاریمان لەوە نییە، هەڵبەتە ئەوە ئیختیاری خۆیشمان نەبووە، بەڵام ئێستا ئێمە ئازادین کە ڕەخنەمان لە فیکری زایۆنستی هەبێت یان ئەگەر تەواو ڕەفزیشی بکەین، تۆ ئەگەر ئەو کتێبەی ئێستاش لای باپیرە خایم ماوە بخوێنیتەوە باش تێدەگەیت!'
ـ 'کام کتێب؟'
ـ 'کتێبی زایۆنست، کتێبێکی سەوزی بچوکە.'
ـ 'ئێ، جا ئەو کتێبە چییەتی، ئێ، ئێ، بەبیرم دێت کاتی خۆی باوکم لە پێنجوێن



چەند جارێك بۆی خوێندینەوە.'

ـ 'ئاخر ئەوەبوو کە وای لەو خەڵکە کرد وڵات و ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێبێڵن و بچن بۆ ئیسرائیل، ئەزانی پێش ساڵی ١٩٤٠ زیاتر لە پەنجا هەزار خێزان لە سەرانسەری کوردستاندا هەبوون، ئێستا ئێمە و چەند ماڵێکی تر ماوینەتەوە.'

ـ 'تۆ پێت وایە هەموویان بە خواستی خۆیان کۆچیان کرد، ئەو هەموو کوشتن و بڕین و ناهەقیانەی بەرانبەر ئێمەکرا... مەگەر هەر جولەکەکانی ئەوروپا ئەوەیان لێ بەسەر هاتبێت، کوڕە بە خوا عەرەبی شۆڤێنست ئەقڵی کوردەکانی خۆمانیشیان تێکدابوو، خۆ ناتوانین ئینکاری لەوە بکەین کە زۆرینەی کورد هەڵگری هەمان بیر و باوەڕی ئەو عەرەبانەن و وەك ئەوان بیردەکەنەوە و وا لە ئێمە دەڕوانن و فەرق ناکەن لە نێوان جولەکەیەك و زایۆنستێکدا.'

ـ 'کەواتە سالار و باپیرە خایم ڕاست دەکەن... پێویستە میلەتی کورد ئەو بەرگە کۆنەپەرستییە لەبەری خۆی داماڵێت و بیری سۆشیالستی و یەکسانی بکات بە بەری خۆیدا، ئائەوەیە کە سالار و هاوڕێکانی خەباتی بۆ دەکەن.'

ـ 'تکات لێدەکەم سارا، واز لەو قسە بێمانایانە بێنە با خوا ئەوەندەی تر غەزەبمان لێ نەگرێت، کوا گەیشتیتە کوێ... بزانم جوامێر لە سجن چی لێ بەسەر هات؟!'

سارا، هێشتا بە بێزارییەوە لە دایکی دەڕووانی، بە دوو دڵییەکەوە سەری بەسەر دەفتەرەکەی دەستیدا شۆڕکردەوە:

"قسەکانی وەکو تیر کاریان لە جگەرم ئەکرد لەگەڵ ئەوەشا نەمویست بیانگرمە خۆم بۆیە خۆم لێ گێل کرد و وتم: ـ قسەی وەکو چی ئەفەرموویت؟ وتی: ـ بەڵێنت داوە لای حاکم بیانکەیت! وەکو ناوی سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوەیە، شوێنی کەلوپەل و چاپەمەنی و سەرچاوەی پوول و پارە، جێگای خۆشاردنەوەیان، پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەتە بێگانەکان و ئەم جۆرە شتانە."

ـ 'ناوی چییە ئەو حەقایەتە؟'



کاتێك سابات ئەمەی پرسی... سارا لە خوێندونەوە وەستا و لە دایکی ڕووانی و وتی:
ـ 'حەقایەتی چی دایە، ڕۆمانە ڕۆمان، ناونیشانەکەی... ژانی گەل'ـە
ـ 'ژانی گەل، کێ نووسیویەتی؟'
ـ 'ئیبراهیم ئەحمەد'
ـ 'ئێ... ئەی ئەمجا؟'
سارا پەنجەیەکی لە نیوان لاپەرەکانی دەفتەرەکەدا ڕاگرتبوو، تاوێك بوو لە بەرگەکەی دەڕوانی... پاش خوێندنەوەی ناونیشانەکەی و ناوی نووسەرەکەی، لە سەر بەرگەکەی بە خەتێکی تۆخ نوسرابوون، دەفتەرەکەی والآ کردەوە و دیسان دەستی کرد بە خوێندنەوەی:



"ئەو هیچی لە هەمانەکەیا نەهێشت و منیش نە توانا و نە بیانووی دان بەخۆدا گرتنم نەما. تێگەیشتم کە نەك ژیان وا دواڕۆژ و ئابڕوو ناموسیشم بەندە بەو قسەیەوە کە ئێستا ئەیکەم و ئەشبێ بیکەم بۆیە تەنیا هەوڵی ئەوەم دا کە لەژێر پەردەی کزۆڵەیدا بیکەم و بەس:
ـ ئەوەی ڕاست بێ باش تێناگەم بڕوام پێ بکە هەر لە سەرەتاوە لە بریندارکردن و گرتنەکەمەوە تا ئێستە هەموو بەسەرهاتەکانی خۆمم وەك سینەما دێتە پێش چاو. وەك فلیمێك کە خۆم تیا سەیر بکەم نەك یاریکەر!"

لە کاتێکدا سارا لە خوێندنەوە وەستابوو، بێدەنگ لە دایکی دەڕوانی، لێوەکانی هێنابوونەوە یەك و دەستێکی بەرەوڕووی دایکی پانکردەوە و ویستی دیسان باسی سالار بکات، لەو کاتەدا سابات لەبەر خۆیەوە وتی:
ـ 'ژانی گەل، ژانی گەل... ئێ ئێ بەردەوامبە.'
سارا سەرێکی لە دایکی ڕاوەشاند و چاوەکانی بەسەر پەڕەی دەفتەرەکەدا داهێشتن:

"بڕیاری چی و بەڵێنی چی؟ هەموو ئەمانە لای من مەتەڵێکن کە هەر تێیان ناگەم نەخوازەڵا هەڵیانبێنم. من فەرمانبەرێکی مووچەخۆری بچووك چیمە بەسەر ئەم جۆرە شتانەوە سەری خۆمم کز کردووە و دەستم گرتووە بە کڵاوی خۆمەوە با نەیبات. کابرا نەختێ ڕەنگی لە توڕەیدا زەرد هەڵگەڕا بەڵام دانی بەخۆیا گرت بە زەردەخەنەی بێڕەزاوە وتی: ـ نە کاکی خۆم یەك جار واش نا. بەڵێ وتوویانە خۆ بە کەمگرتن جوامێرییە بەڵام خەڵك بە کەر زانینیش ژیری نییە. بە پەلە و شڵەژاوی وتم: ـ نا قوربان هیچ نیازم ئەوە نەبوو کە خوا نەکردە جەنابتان بە تێنەگەیشتوو و نەزان دابنێم! هەیە ناوی ئێوە نەبیستبێت؟ چەندان جەریمەی گرنگ گرنگتان دۆزیوەتەوە.'

ـ 'ئێستا دەزانم بۆچی باوکم و مەحموو ـ دە فەنی ڕقیان لە سالار هەڵگرتووە. بەڵام تێناگەم تۆ بۆ؟!'
ـ 'توخوا سارا واز لەو مەسەلەیە بێنە و ئەوەندە پچڕ پچڕ ئەو حەقایەتەم بۆ مەخوێنەرەوە!'
سارا چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسك و لەوەدابوون بڕژێنە سەر ڕوومەتەکانی، تۆنی دەنگی گۆڕابوو، بە بێزارییەکەوە بەردەوامبوو لە خوێندنەوە:

"ئێوە... بە نەختێ توندییەوە قسەکەی پێ بریم و وتی: ـ پێچ و پەنای پێ ناوێت، من ئەموویست تۆ ڕزگارکەم چونکە وام ئەزانی لە ساویلکەیی و دڵپاکییەوە تێگلێنراویت و جوانکەی، بە گوناهم زانی بە خوت و خۆڕایی تیابچیت، بە تایبەتی کە مەسەلەکەشت لە ڕۆژ ئاشکراترە و خۆشت بەڵێنت داوە کە هەرچی ڕاستی هەیە بە کاربەدەستانی بڵێیت. زۆر سوپاستان دەکەم بەڵام باوەڕکە وا بزانم خراپیان تێگەیاندوون من هیچ بەڵێنێکم بە هیچ کەسێك نەداوە کە ڕاستی هیچ نهێنییەکی پێ بڵێم، چونکە هیچ نهێنییەك نازانم."



سارا لە کاتێکدا سەری بەسەر دەفەتەرەکەدا شۆڕکردبۆوە... لەژێر لێوەوە وەکو لەگەڵ خۆیدا بدوێت: 'دین، دین، سەرجەم ئەو دیانەتانە وەك برینێك وان لەسەر ڕۆح و جەستەی مرۆڤایەتی و بەردەوام خوێن و کێم و جەراعەتیان لێدەچۆڕێت.'

شیوازی دانیشتنەکەی گۆڕی و بە بێ ئارامییەکەوە چەند جارێك هەستایە سەرپێکانی، دیسان لە جێگای خۆی دانیشتەوە، هەناسەی توند بووبوو، ئازارێکی کوتوپڕ سەر سنگی داگرتبوو، پاشان لەپڕێکدا بە ڕاپەڕینەوە خۆی ڕاست کردەوە، وەستابوو لە خوێندنەوە و دەفتەرەکەی داخستبوو... هێواش لەسەر کۆشی داینا و هەردوو دەستی بە سنگییەوە گرتن، سەری بەسەر سنگیدا شۆڕ کردبۆوە و ماسولکەکانی دەمووچاوی گرژبووبوون، لە کاتێکدا لە عەزرەتدا ڕانەکانی کۆکردنەوە و هەڵیکێشان بەرەوسەر لێواری قەنەفەکە... ڕەشنووسی ڕۆمانی ژانی گەل کەوتە سەر زەوی، برۆکانی هێنانەوە یەك و چاوەکانی توند نوقاندن، دیاربوو سابات ـ ی دایکی بەدەم شلیلە چنینەوە لە ناو خەیاڵی خۆیدا نوقم بووبوو... بە خەیاڵ هێشتا لەناو دیمەنی ڕووداوەکانی ڕۆمانی ژانی گەل ـ دابوو، بێئاگابوو لە سارای کچی، تا ئەوکاتەی سارا لەتاو ئازار خۆی لەسەر قەنەفەکە پێڕانەگیرا و لەپڕێکدا بەربۆوە سەر ئەرزی هۆڵەکە، وەك گیاندارێکی پێکراو هەردوو دەستی تووند بە سنگییەوە گرتبوون و لەپەسا تەپاوتلی دەکرد.



ئەوجا سابات لە عەزرەتدا لە جێگای خۆی ڕاپەڕی و شیش و گلۆڵەی شلیلەکانی بە چواردەوری سارا ـ دا پژاند و بەدەنگێکی بەرز:

ـ 'سارا، سارا... ماڵوێران خۆم، مەحموود، ڕۆڵە مەحموود.'

لە کاتێکدا سابات بەرەو دەرگای هۆڵەکە بە پەلەپرووزێ چوو... لە ناو دەرگاکەوە بەو قاڵدرمانەدا هەڵی ڕوانی کە بەرانبەر دەرگای هۆڵەکەبوون و بەرەو قاتی سەرەوە دەکشا، بانگی لە مەحموودی کوڕی کرد، قاتی سەرەوەی ماڵەکەیان تەنها دالانێك و دوو ژوور بوو... ژووری سارا و مەحموود، دیسان چەند

جارێك بانگی لە مەحموود کرد، گەڕایەوە لای سارا و دانەوییەوە بەسەریدا و لە تەنیشت سارا ـ وە کەوتە سەرچۆك، باوەشی پێدا کرد... پاش ئەوەی خستییە سەرپشت... هەردوو دەستی لە بنباڵەکانی توند کردن و ڕایکێشایە سەر ڕانەکانی خۆی، پاشان دەستێکی بە ڕوومەتی ساردییەوە گرت و بە دەستەکەی تریشی لەپەسا و هێواش لەسەر بۆ خوار بە سەر سنگ و نێوان مەمکە قوتەکانییدا دەهێنان و لە ڕوخساری تێك چووی سارای دەڕوانی، بەدەم گریان و هەنسك هەڵکێشانەوە:

ـ 'مەحموود، ڕۆڵە مەحموود فریاکەوە. سارا گیان، خوایە چیبکەم.'

لەو دەمەدا مەحموود هێواش هێواش بە قاڵدرمەکاندا هاتەخوار، قاتێك بیجامەی خەت خەتی لەبەردا بوو وەکو تازە لە خەو ڕابووبێت، لەبەر خۆیەوە و بە بێزارییەکەوە:

ـ 'چییە، دیسان بەزمەکەیە؟!'

ـ 'بەزمی چی ڕۆڵە گیان، هەناسەی لەبەر بڕاوە و ژانی زۆرە، ئادەی خێرا، دەی خێراکە... با زوو بیگەیەنینە خەستەخانە.'

ئەوکات مەحموود لە ژورەکەی خۆی شەو و ڕۆژ سەرقاڵی خوێندن و خوێندنەوە بوو، قوتابی پۆلی شەشەمی وێژەیی بوو، مەحموود پێشتر گوێی لە هاوار و بانگی دایکی بوو، بەڵام سارا و سابات ڕۆژانە ئەوەندەیان گێچەڵ بە مەحموود دەکرد تەواو بێزار بووبوو لێیان، بێجگە لەوەی ڕۆژی چەندین جار دەیاننارد بۆ گوڵەبەڕۆژە و قەزوان و بنێشت کڕین.



# فیکر و بەرگریی

بەیان سەلمان



لە زمانە ڕۆژئاواییەکاندا زۆرجار باسکردنی هونەر شێوازێکی دەربڕینە بۆ هەموو جۆرە کارێکی داهێنەرانە لە هەموو بوارێکدا؛ وەك نووسین و فەلسەفە و ماتماتیك وهونەر و هتد. بیرۆکەی بەرگریی لە هونەر بە هەموو واتای ئەو بوارانەی پێشوو، شێوەیەکە لە داکۆکیکردن لە مافی داهێنان، لە مافی دەرچوون لە باو و نەریت، خۆ پاراستن لەوەی بیری گشتیی و بیری داپلۆسێنەرو فشارکەر دەیسەپێنێتە سەر داهێنەر. ئیدی ئەمە بە هەرچ هۆیەك بێت و یان

هەرچ کەس و لایەنێك بێت. بیری باو هەمیشە بەدوای ئەوە دەگەڕێ ئەویتر وەك ئەو بیربکاتەوە. لە چەشتنی ئەو بابەتەکان داڕێژێتەوە و "داهێنانیشی" لە ئاست چاوەڕوانی ئەو بێت. لەم دۆخەشدا کە داهێنان بە پێی داواکاریی و فشارخستنە سەر بێت، دەشکرێ زۆر بە چاکیی بپرسین: ئەمە بە داهێنان لەقەلەم دەدرێ؟ کە بیری کەسێك "سازگار" بێت، دەقاودەق هاوڕای بیری باو و ناسراو بێت، بە مەیلی ئەو بێت، تەواو کۆك و گونجاو بێت لەگەڵی، ئیدی چۆن بە داهێنان سەیر دەکرێ! جگە لەوەی داهێنان لە قۆناغێکدا مەرج نییە هەمان خوێنەوە تێگەیشتنمان بۆی هەبێ، نووسینێك، تابلۆیەك، فیلمێك، بیرێکی فەلسەفی و وەزیفەیەکی ماتماتیکی... ڕەنگە کەسەکە ساتێ سەیری بابەتێك دەکات، گوێی لێدەگرێ، یان دەیخوێنێتەوە و ئیشی لەسەر دەکات وا لە کەسەکە دەکات لە چرکەی ئەو کردارە هەڵبێت، بەڵام بە تێپەڕبوونی سالآنێك، ئەوەی ئەو بابەتەی جێی نمایشی چاوی و گوێی و بیرکردنەوە و لەژێر دەستی بوو، کە بگەڕێتەوە سەری و پەسەندیکاتەوە. بێگومان ئەم جارەشیان هەر بە پێوانەی خۆی و بە دەسەڵاتی خۆی بەمە هەڵدەستێ. ئاڵۆزیی فیکر لەوەدایە کە بینینی جوانیی و بیرۆکەی گرنگ و ناوەڕۆکی دەقێك چ لە ڕووی کات و چ لە ڕووی شوێن نە بەهەمان شێوە دەبیندرێ و نە بەهەمان پێوەر هەڵدەسەنگێندرێت. لێرەوە دەکرێ داهێنان زۆر بەسادەیی بریتیبێت لەوەی چی وا هەستم دەبزوێنێ و لە ئاستیدا وشەی دەربڕینم پێ نییە. لەوانەشە وەك تیشکێك بەلای کەسەکەدا تێپەڕێت و بابەتی لەلا بوروژێنێت، ئیلهام بەخش بێت و بیخاتە ناو پرۆسەی بیرکردنەوە. بەم مانایە ئەم پێشنیارە زۆر دوورە لە پێوەری ئامادەکراو وەك پێکهاتەکانی خواردنێك کە پێش وەخت دەزانین چی پێویستە و بەو کەرەستەیە ئامادە دەکرێ.

بیرۆکەی بەرگریی هاوڕایە لەگەڵ بیرۆکەی یاخیبوون، یاخیبوون و بەرگرییش بەرامبەر بە فۆرمی خۆد سانسۆرو خۆ خەفەکردن دەوەستێتەوە. ئەوەی هەستی بریندارە و ناتوانێ بەرگریی بکات، پەنا بۆ خود سانسۆری دەبات و لەوانەیە ئەو بیروڕایانەی پێیەتی خەفەیان بکات. ئەمەش لە خودی خۆی فۆرمێکی مردنە.

نموونەی مرۆڤی یاخیبوو لەلای ئەلبێر کامویە کە دەڵێ "نا" و سەر دانانوێنێ بۆ "بەڵێ"یەکی لە قاڵبدراو و ئامادەکراو بە پێی داواکاریی. بەرپرسیارێتی فەیلەسوفە بەرامبەر بە خۆی و بەرامبەر بە کۆمەڵ؛ دەکرێ بڵێین خۆپێداچوونەوەیە، بە ئاستی





فیکر و خۆ هەڵسەنگاندنیشە. یاخیبوون و بەرگریی دوو فۆرمی کردارێکی هاوبەشن بۆ پێویستیی داهێنانیش. دەبنە ژێلمۆی کرداری داهێنەرانەی زۆر گرنگ لە هەموو بوارێکدا، تەنانەت لە خودی سیاسەتیشدا دژی پۆلیسی فیکری و بەشریی، کاتێ بۆ نموونە دەسەڵاتی قسەکردن دەدرێتە دەستی بێ دەسەڵاتەکان، ئەو کەسانەی لە ژیانی ڕۆژانەیاندا ماشێنی ستەمکاریی دەیانهاڕێ و کەس هاوڕیان لێ ناداتەوە؛ وەك کەسایەتییەکانی "ژێرمینال"ی ئێمیل زۆلا، یان هیچ نەبێ بە ناوی ئەوانەوە قسە دەکرێ، یاخود لەلای ڤیکتۆر هوگۆ لە دەقی گوتارەکەی لە ئەنجومەنی ناوچەیی، لەبری نەهەماتیی خەڵکی هەژارو بێ دەرەتان و بێ دەسەڵات دەڵێ: "بەڕێزان، من لەگەڵ ئەو کەسانە نیم کە بڕوایان بەوەیە دەتوانین دەردو نەهامەتی ئەم دونیاییە بسڕینەوە؛ من لەگەڵ ئەو کەسانەم کە بڕوایان وایە دەتوانین دەردو نەهامەتی لەناوبەرین.". ئەم فۆرمە بنەڕەتییە لە یاخیبوون و چاو نەترسیی بۆ پشتگیریی ئەوانەی دەسەڵاتی قسەکردنیان نییە، لە خودی خۆی شۆڕش و بەرگرییشە.

بەرگریی کردەیەکی زۆر زەحمەتە، بەرپرسیارێتییە بەرامبەر بە خود و خودی ژیان، ئەمەش لە دەسەڵاتی هەموو کەسێك نییە. بابەتی یاخیبوون و بەرگریی دەکاتە ئەوەی ئەوبەرو ئەمبەر، ئەوان و تۆ (لەوانەیە تۆ بە تەنیا)، ئەمەش جەنگێکە ساردبوونەوەی نییە و دەبێتە ئەو هۆیە زلەی کەسەکە هاندەدات تابلۆیەك بکێشێ، دەقێك بنووسێ، ئاوازی موزیکێك دابنێت و کۆنسێپتێك داهێنێت، هتد. لێرەوە یاخیبوون و بەرگریی فۆرمێکی ڕەتدانی کات و شوێنیان هەیە، کردارێکی یونیڤێرسەلە و هەموو کردارە بچووکەکان ڕەتدەداتەوە. دەکاتە خودی ئەو ساتەی پاش مردن هێشتا لێیدەدوێین بۆ ئەوانی دی، قسە دەکەین و زمانمان لە کار کەوتووە، سەیری تابلۆکان دەکرێن و هونەرمەند لێرە نەماوە، دەچینە تەماشای شانۆگەرییەك و نووسەرەکەی تەنها دەقەکەی بەجێهێشتووە. لێرەشدا ناتوانین بەسەر پارچە شانۆگەریی "یەك شاخ، یان کەرکەدەن" تێپەڕێن بێ ئەوەی ئاماژە نەکەین بەم لایەنی بەرگرییە دژی بیری باو و گشتیی، کاتێ بیرانژێە، کە تەنانەت بە پێی تیۆریی ئەدەب پاڵەوانیش نییە، بەڵکو دژە پاڵەوانی شانۆگەرییەکە، دژ بە هەموو دانیشتوانی

شاره كه ورده ورده گشتیان دەبنه كەركەدەن و رازیش دەبن ببن بەو ئاژەڵە. بیرانژێه بەو دەسەڵاتەی بەسەر خۆیدا هەیەتی دژ بە "مێگەل" تا كۆتایی هەر بەرگریی دەكات و سەر دانانوێنێ. لەوانەیە "بەرگریی بە خودی بەرگریی بكرێت" وەك جیل دولوز دەڵێ، نموونەی ئەمەیش هەروەها لە دەقێكی بەرگریانەی وەك "١٩٨٤" ی جۆرج ئۆروێڵ دەبیندرێ كاتێ خودی ئەدەب دەبێتە ئامرازێكی بەرگریی. یاخود لە داهێنانی هونەریی "هونەر بۆ هونەر"، تێبینی بكرێ، یان لە سینەما بە شێوەی هەمەجۆر خراوەتە ڕوو، چ لە ڕوووی ناوەڕۆك و چ لە ڕووی فۆرم. شێوەكانی خستنە ڕووی بەرگریی، ڕەتكردنەوە، یاخیبوون، خۆ دووركرتن، ڕەخنەگرتن، گومانكردن...بە زمانی هەمەجۆر و شێوەی جودا دەردەبڕێن بۆ ئەوەی بۆچوونی نوێ و لە ڕوانگەی نوێوە نمایش بكرێن. جاری وەهاشە ئەمە لە فۆرمی ڕاستەقینەی ژیاندا تێبینی دەكرێ كە هەرزەكارێك یاخیدەبێ لە فەرمانی جیهانی گەورەكان، بە فۆرمی نوێی بیركردنەوە و بۆچوون بەرگریی لە خۆی دەكات و هەندێ جار ئاڵۆزە تێگەیشتنی. ئەم جۆرە ناتێگەیشتنەش بەرامبەر بە هەموو ئەو بەرهەمانەشە كە بەرگرییان كردووە لە باو و ناسراو و بیسراو و بینراو...هتد.

هەر وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد، ئەوەی ئەمڕۆ لێی تێناگەی چ كەسێكە و یان تابلۆ و دەقێك و موزیكێك و هاوكێشەیەكە، دەكرێ زۆر بە باشیی سبەی و دوو سبەی لێی تێبگەی و یان هیچ نەبێ لێی نزیك ببییەوە. جیل دولوز كە بۆ تاقە جارێك ڕازیبووە لە فیلمێكی تەلەڤیزیۆنیدا چاوپێكەوتنی لەگەڵ بكرێ و بە پێی "ئەلف با" پرسیاری ئاراستە بكرێ، لە پیتی (پ) كە كلێر پارنێ وشەی (پرۆفیسۆری) بۆ دەوروژێنێ، جیل دولوز تەنانەت سەبارەت بە خودی بوونی بە پرۆفیسۆرێك لە زانكۆی ڤانسان- پاریسی هەشت، بە جۆرێك باس لە وانەكان دەكات كە ئەمانیش بریتین لەوەی بەشێكی خوێندكارەكان لێی تێبەگەن و یان بە نیوەچڵی و یاخود هەر لێی تێنەگەن. لە جێیەكەی تر دولوز خۆشی دەخاتە ناو ئەو دۆخی تێگەیشتن و ناتێگەیشتنە ساتییە. هەروەها دەڵێ:"(...)ئامانجی وانەی ناو پۆل بریتیە لەوەی بەرپەچدانەوەی خوێندكار بزانی و كۆنسێپتەكان بخەیتە ڕوو.". جگە لەوەی جۆری خوێندكارەكانی ئەو زانكۆیە (بە پێی جیل دولوز) هێندە هەمەرەنگن، ئەمە بۆخۆی هاندەرە كە بابەتی گرنگت لەلا بوروژێ و بزانی بەرپەچدانەوەی خوێندكارەكان چۆنە.

لە پیتی (ر) لە مەڕ بەرگریی پرسیاری لێ دەكرێ كە وشەكە بە فەرەنسی دەكاتە





ڕێزیستانس Résistance، دولوز جەغت لەسەر داهێنانی کۆنسێپت دەکات، داهێنانی کۆنسێپت بە نێوەندی فەلسەفە. کۆنسێپت وەك پێویستییەك، لێرەشدا فەیلەسوف خۆی پێشنیار دەکات بەوەی کۆنسێپت دادەهێنێت. کە بیرکردنەوە لە ئارا بوو، کۆنسێپت دادەهێنرێ و لە دوای ئەمیش بیرۆکەی تر دێن و کۆنسێپتی دی دادەهێنێت. ئەم بازنە پڕ جوڵەیە، بە خۆڕایی ئەم سوڕەی خۆی ئەنجام نادات، بەڵکو هەر سوڕێکی دەبێتە پاڵنەرو هاندەر بۆ سوڕی داهاتوو، بێ ئەوەی لە بازنەیەکی بەتاڵدا بسوڕێینەوە. بیرۆکەکان بەم شێوەیە دەگوازرێنەوە و دەبنەوە هەوێن بۆ بیرۆکەی تر. ئەمەش تا ڕادەیەك لە چرکەی هەنوکەدا ڕوودەدات و بە نێوەندی جۆرە گونجانێك لە نێوان بیرۆکەکانی ڕابردوو و ئەوانەی داهاتوو ڕێڕەوێك دروستدەبێ کە هەمیشە بیری نوێ بە ناویدا هاتوچۆ دەکەن. ئەم هاتوچۆیە بابەتەکان لە خەملاّنن و ئەگەر کەمدەکاتەوە. بەم پێیە بیریار دەخاتە ناو کێڵگەیەکی بیرکردنەوەی بەردەوام کە تەنانەت لە چرکەی ناڕێکخستن و جەنجاڵیشدا بیرکردنەوە هەر چالاکە و جێی خۆی دەگرێ.

کلێر پارنێ دیسان سەبارەت بە داهێنان و بەرگریی، بەم شێوەیە جیل دولوز دەدوێنێ:
تۆ لە جێیەکدا وتت: "فەلسەفە کۆنسێپت و فۆرمی کۆنکرێتیی دروستدەکات، ئیتر بەرگریی دەکەین. نووسەر، فەیلەسوف، هونەرمەند... هەموو ئەمانە بەرگریی دەکەن، بەڵام بە وەردیی پێمان بڵێ بەرگریی لەچی دەکەن؟
لە هەموو شتێك. لە سەروو هەمووش، بەرگری دەکەن لە مەشق پێکردنیان لەسەر بیروڕای باو کە دەیانەوێ بیسەپێننە سەریان. واتە هەموو ئەو بوارانەی لێپرسینەوەی گەمژانەی لەبارەوە دەکرێ. بە واتایەکی تر، بە توندی داوایان لێدەکەن ڕیتمی ئەوانیان هەبێ. لە کاتێکدا نووسەر و هونەرمەند و هەموو ئەوانە، ناکرێ فشار بخەینە سەریان و بە ڕیتمی ئەوان کار بکەن. من بڕوام وایە چونکو ئەوانە بەرگریکەرن، فۆرمی بیرکردنەوە و داهێنانی هونەریی خۆیان هەیە، هۆی ئەم بیرکردنەوەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێیان شەرمە مرۆڤ بن. یەکێك لەوانەی بە جوانی ئەم بیرۆکەییەی دەربڕی (پریمۆ لیڤی)یە کە دەڵێ: " کە ئازادکرام بیرۆکەی شەرمکردنم بە بوونم وەك مرۆڤ بەسەرمدا زاڵبوو.". ئەم ڕستەیە لە هەمانکات

جوانە و پرشنگدارە و کونکرێتیشتە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە ناکاتە ئەوەی هەمووومان تاوانباربین، بۆ نموونە ناکاتە ئەوەی کە هەمووومان نازی بین. پریمۆ لیڤی بە جوانی ئەوە دەردەبڕێ کە نەخێر ئێمە هەمووومان تاوانبار نین، نابێ ئەوەی "لەگەڵ" و ئەوەی "هاودژە" تێکەڵکەین. مەبەستی راستی لەو بەرگرییەی پێشوو ئەمەیە کە هونەر لێرەیە بۆ ئەوەی لەسایەیەی ئەو، ڕۆحی بەندکراوی مرۆڤ ئازاد بکات؛ چونکو مرۆڤ وازناهێنێ و خۆی بەجێناهێڵێ کە ژیان زیندانی بکات و بیکوژێت. هونەر لێرەیە بۆ ئەوەی جوانیی بکاتە سەر ژیان، بەهایەکی بەرزی پێ ببەخشێ، زۆر تایبەتیی بێت، کە مرۆڤ دێت و ئەو شتە نالەبارانە دەکات، لێرەدا ئەمان شەرم دەکەن کە مرۆڤن. ئەم بیرۆکەیە لەو ئاستەشدا نییە کە باسی ئاوشڤیتز بکەین، بەڵکو ئەگەر ئەو جۆرە هەستە لەلامان نەبێت، تەنانەت بۆ شتی بچووکیش، ئەوە ئیدی پێویست ناکات کاری هونەریی بکەین. بەرگریی بە خودی بەرگریی دەکرێ.

کلێر پارنێ دیسان لە جیل دولوز دەپرسێ: ئایا وەك هونەرمەندێکی داهێنەر بەردەوام هەست بەوە دەکەی کە مەترسی بە دەورتەوەیە و لە هەموو شوێنێکە؟
بە دڵنیاییەوە، تەنانەت لە فەلسەفەشدا، بۆ نموونە چۆن بەرگەریی بکەین لە گەمژەیی. بە گشتیی وا دەزانین کە فەلسەفە هەر بۆ ئەوە باشە کە پاش شێو خوارن بکەوینە قسەکردن! بەڵام ئەگەر فەلسەفە نەبوایە نازانین ئاستی گەمژەیی لە کوێیە! گومانمان نابێت. بێتو هونەر نەبووایە کەس توانای بەردەوامبوونیشی نەدەبوو.



کلێر پارنێ دەپرسێتەوە: ئەی ڕات چییە بەرامبەر بە مردنی ئەدەب، فەلسەفە، سینەما...(دولوز پێکەنی).
جارێ مردن وەك مردن هەر نییە! بەڵکو کوشتن لە ئارادایە. لەوانەیە سینەما بکوژن، بەڵام بە مردنێکی سروشتیی نامرێت. هۆیەکەشی سادەیە، هەتا شتێك خۆی جێگیر نەکات و شوێن وەزیفەی فەلسەفی نەگرێتەوە، فەلسەفە تەواوی هەقی بەردەوامبوونی دەبێت. ئەگەر شتێکی تریش وەزیفەی فەلسەفەی دەبێ، من نازانم بۆ دەبێ ئەوە شتێکی تر بێت غەیری فەلسەفە خۆی؟ ئەم بیروڕا گەمژانە چییە کە باسی مردنی فەلسەفە دەکەن. دەکرێ سانسۆر بکرێ، ڕێی لێ بگیرێ و بکوژرێت، بەڵام مردن...!

ئەگەر فەلسەفە داهێنانی کۆنسێپت بێت، ئەوە تەنها گەمژەکانن کە بەدوای داماڵینی پێستی فەلسەفە دەگەڕێن؛ دەنا چی لە جێی فەلسەفە کۆنسێپت دادەهێنێت؟ ئینفۆرماتیك؟ دانەرانی ریکلام؟ تەنانەت لە ناو ڕیکلامیش کە باسی مەعکەرۆنە دەکەین، کۆنسێپتی مەعکەرۆنە هاودژ نییە لەگەڵ فەلسەفە، ئەوە ڕیکلام خۆیەتی کە هاودژیی فەلسەفە دەکات، چونکو ئێمە دانەری کۆنسێپتین.

کلێر پارنێ: دەکرێ بڵێین کە سێکوچکەی ئێوە: دولوز، فیلیکس گواتاری و فۆکۆ تۆڕێکن کۆنسێپت پێکدەهێنن وەك تۆڕێکی بەرگریی، وەك ماشێنێکی جەنگ دژی بیرۆکەی زاڵ و باو؟

بەڵێ، بۆ نا! ئەمە شتێکی چاکە ئەگەر وابێ. دژی فێرگەی باو تۆڕێکی بەرگریی بە خودی بەرگریی دروست بکرێ.


سەرچاوەی چاوپێکەوتنی جیل دولوز:

- Gilles Deleuze – Claire Parnet, « Abécédaire (Extrait) » téléfilm réalisé par Michel Pamart, 1988.

سەرچاوەی تر:

- Albert Camus, L'homme révolté, Éd. Gallimard, Folio essais, 1985.
- Emile Zola, Germinal, roman, Éd. Gallimard, Folio, classique, 1999.
- Eugène Ionesco, Rhinocéros, pièce en trois actes et quatre tableaux, Éd. Gallimard,1959.
- Georges Orwell, 1984, roman, Éd. Gallimard, Folio, 1972.
- Victor Hugo « discours sur la misère » à l'Assemblée Nationale le 9 juillet 1849.

کارلۆس رویز زافۆن

# سێبەری با

لە سویدییەوە

هیوا قادر



بەشی یەکەم

# کلاسیکی کوردی و کلاسیکی ئەورووپی

ئەحمەدی مەلا

## پێشەکی

هارتموت ستێنزێل لە سەر بەکارهێنانی دەستەواژەی "کلاسیزم"ی فەرەنسی و دەستەخوشکە ئەورووپییەکانی بابەتێکی تێروتەسەل لە "مێژووی فەرەنسای ئەدەبی" دەنووسێت. شیکردنەوە و راڤەکردنی ئەم بابەتە دەکەینە پلاتفۆرمێك بۆ ئەوەی ئاورێك لە هەمان دەستەواژە بدەینەوە کە لە زمان و ئەدەبییاتی کوردیدا بەکاردێت. دەبێ بزانین تا چ رادەیەك بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە لە ئەدەبییاتی کوردی جێگای خۆی کردۆتەوە و ئەگەریش جیگای خۆی کردبێتەوە مەبەست لە چ جۆرە بەرهەمێکە؟ئایا ئەم بەکارهێنانە ئاماژە بۆ قۆناغ و سەردەمێکی دیاریی کراو دەکات، یا ئاماژە بۆ ناوەڕۆکی ئەو بابەتانە دەکات؟ ئایا بەکارهێنانی "شیعری کلاسیکی کوردی" یا فراوانتر "ئەدەبی کلاسیکی کوردی" چی لە لای خوێنەری کوردی دروست دەکات، ئایا دەستنیشانێکی دروستە و وێنەیەکی روون لە لای خوێنەر دروست دەکات، یا بە پێچەوانەوە ئاماژە بۆ ئەتمۆسفێرێکی تەمومژاویی و لێڵ دەکات؟

بە زمانی فەرەنسی یەکەمجار، ستاندال، لە ساڵی ١٨٢٣، لە نێو بابەتێك کە



لە سەر راسین و شکسپییر نووسیبووی، دەستەواژەی "کلاسیزم" بەکاردەهێنێت، ئامانجی ئەم بەکارهێنانە ئەو بوو کە قۆناغی نووسین بەرامبەر بە یەك دابنێ، ئەویش "رۆمانتیسم" بکاتو "کلاسیزمە". پێی دەچێ ئەم تێرمەی یا لە ئیتالی، یا لە ئیسپانی، یا لە ئینگلیزییەوە وەرگرتبێت. بە گوێرەی ستاندال :" رۆمانتیسیسم ئەوەیە کە هونەری پێشکەشکردنی بەرهەمی ئەدەبییە هاوچەرخە بۆ ئەوەی ئارەزوو بداتە خوێنەری ئێستا. کلاسیزم، بە پیچەوانەوە، لەززەتی بەرهەمی ئەدەبی پێشکەش بە باب و باپیرانیان بکات." سەرهەڵدانی ئەم دەستەواژەیە لە ساڵانی بیستی سەدەی نۆزدەهەم، لە نێو تەقلیدە ئەدەبییەکاندا مشتومڕ پەیدا دەکات و ئیدی لە هەمان کاتدا ئاماژە بۆ نۆرم و مێژوویەکی دیاریی کراو دەکات.

دەبێ ئەم بەکارهێنانە سەرنجمان بۆ پرسیارێك رابکێشێ : بۆچی لە ساڵانی بیست، نەك پێشتر ئەم دەستەواژەیە سەریهەڵدا؟ ئەم دەستینشانکردنەی ستاندال دەکەوێتە نێو هەلومەرجی "پۆست شۆڕشەوە" کە لە ئەرکە دژ بەیەکەکانی ئەدەب دەخرایە بەر باس، ئەویش لە ژێر دەستەواژەی "رۆمانتیسم" و "کلاسیسم" هەر وەك لە لایەن ستاندالەوە ئاماژەی بۆ کرا. ئەم ململانێیە، هەر وەکو ئۆرگانی "گلۆب" کە زمانحاڵی ئەنتێلکێتواڵە بەرهەڵستکارەکانی ژێر دەسەڵاتی "رێستۆراسیۆن" بوو ( رێستۆراسیۆن دەکەوێتە نێوان روخانی ئیمپراتۆرییەتی یەکەم، ٦، ئەڤریلی ١٨١٤ ٢ شۆڕشی تەمووزی ١٨٣٠)، گۆڤارەی ناوبراو دەنووسێ :" رژێمی کۆن خەبات دژ بە نوێ و پشکنین دەکات" ( ئازار ١٨٢٥). ئەگەر بێت و مەدام ستێل ئەم دوو دەستەواژە دژ بەیەکەی لە نێو مشتومڕ و دەمەتەقێی ئەڵمانییەکانەوە هێنابێتە فەرەنسا، بۆ ئەوەی دوو چەمك روو بە رووی یەك بکرێتەوە، لە لایەك "شیعری رۆمانسی" کە لە گەڵ "مۆدێرنەکان" هەڵ دەکات و "کلاسیزم"ە. مشتومڕەکان لە ساڵانی بیستی سەدەی نۆزدە گوڕ دەسێنێت بۆ ئەوەی "رۆتین" بەرامبەر بە "سەربەخۆبوون" و " چەقبەستن" بەرامبەر بە "بزیوی و بزووتنەوە" بوەستن. لە نێو ئەم دووە، دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرین ( گلۆب،نۆڤەمبەری، ١٩٢٥). بۆ ئەوانەی کە بەرگریی لە تەقلید دەکەن، هەموو جوولە و بزووتنەوەیەك بە هەڕەشە لێکدەدەنەوە و هەیکەلی هەرەمییەت تێکدەشکێنێ و بەها باوەکان دەلەقێنێ. ئەمە لە کاتێکدا کە " چ لە بواری ئەدەبییاتدا بێت یا لە بواری سیاسی، شۆڕشێکی سەرتاپا هەموو شتێك بێتە سەر رێگای رایدەپێچی{...} هەموو شتێك : شکۆی رابردوو و بەختەوەری ئێستا و هیوای ئایندە بەرەو خەڕەند شۆڕ دەکاتەوە." بە ئاشکرا دیارە کە لەو سەردەمە بەرەورووی هەموو رێبازێکی نوێ دەبوونەوە، سەرباری





ئەوەی هێشتا رۆمانسییەت پێ داگریی لە بوونی خۆی نەکردبوو. ئۆژێ، بەڕێوەبەری ئەکادیمای فەرەنسی، لە ساڵی ١٨٢٤ بە روونی باس لە سەرهەڵدانی ئەو جۆرە رێبازە ماڵکاولکەرە دەکات و ئاماژە بۆ ئەدەبییاتێك دەکات کە وەك نموونەی خۆراگریی و پتەوەیی نۆرمەکان و هاوتەبایە لە گەڵ هاورمۆنی و هەمەئاهەنگی کۆمەلآیەتی و دەڵێت :" عەرەش تاهەتایە لە سەر خاکێکی جێگیر و پتەو رەگهاژووە کە هێچ راوەشانێك ناتوانێت بیلەقێنێ."

فەرەنسای قۆناغی "رێستۆراسیۆن"، دوا بەشی قۆناغێکە کە دەکەوێتە نێوان شۆڕشی ١٧٨٩ و شۆڕشی گەلاوێژەوە، ئەوە بە هەند وەردەگرێت کە توخمە بنەڕەتییەکانی گوتارێك لەمەڕ "کلاسیزم"ەوە بەرهەمبهێنێت ؛ ئەمە هەوڵێکە دەچێتە نێو ئەو هەولآنەی کە دەسەلآتی ئەو سەردەمە رەگهاژوو بکات و شەرعییەتی بداتێ، ئەمە بە "پشت ئەستوورکردنەی کلاسیزم و دەسەلآت" دەژمێردرێت، کە لە لایەن "گلۆب"ەوە سەرکۆنە دەکرێ ( ئازاری ١٨٢٥). ئەم هەوڵدانە لە پێناو جۆرە ئەدەبێکی دیکەیە کە ئەو لە جوولە و بزووتنندایە، بەرامبەر بە رۆمانتیسمێك کە خەریکە رەنگێکی سیاسی بە خۆی دەبەخشێ، خەون بە ئەوەوە دەبینی کە ببێتە " لیبرالیسمێك لە بواری ئەدەبییاتدا" وەکو ڤیکتۆر هیگۆ لە گۆڤاری ناوبرا ئاماژەی بۆ کردبوو. بە کۆنسێپتکردنی "کلاسیزم" لەوەوە شیکل وەردەگرێت بۆ ئەوەی رێگریی و تەگەرە بخاتە بەردەم بزووتنەوەی رۆمانتیکی. ئەم شیکلپێدانە لە بەر سێ هۆکار ئەنجام دەدرێن :

- هۆکاری یەکەم لە پێناو ئەوەی کۆنسێپتێك بدرێتە ئەدەب کە ببێتە پاڵپشتی دەسەلآت.
- هۆکاری دووەمیش کە ئەمیان گشتی تر و گرنگتریشە، ئەویش بەهابەخشینە بە "کلاسیزم". ببێتە بەرهەمهێنەری واتا لە ئاستی جیهاندا و هەموو کەرەسەیەکی رەخنەگرانە و ئیلتیزامخوازانەی لێ بسەنرێتەوە. بە پێچەوانەوە، ئەدەبییاتی رۆمانسی ئەو دوو خەسڵەتەی سەرەوەی بە خۆ دەبەخشی.

لەم ناولێنانە، بە شێوەیەکی تەواو سنووردار دەیەوێ دەستەواژەی "کلاسیزم" بخاتە نێو تەقلیدێکی ئەدەبی نیشتیمانییەوە. ئەوەش بە بێ سێ و دوو، سەدەی حەڤدە دەگرێتەوە کە جاران بە :سەدەی لویسی مەزن" نێوزەد دەکرا، دواتریش بە کورت و پوختی ئاماژە بۆ "سەدەی مەزن" دەکرد و هەندەی نەبرد بوو بە "سەدەی کلاسیك".

ئاشکرایە داڕشتن و دروستبوون و بەرهەمهێنانی ئەم دەستەواژەیە لە پڕێکدا نەهاتۆتە کایەوە. پابەندی گەشەندنێکی تایبەتە و لەوێوە بەهاکانی خۆی وەدەست دەهێنێ و بە تێپەڕینی کاتیش خۆی ساغ دەکاتەوە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا پێگەی خۆی پتەو دەکات و لە سەدەی بیستەمدا دوا شیکلی خۆی وەردەگرێت. ئەو گۆڕانکارییانەی کە ئەو دەستەواژەیە دووچاری دەبێ وردە وردە بۆ هەڵسەنگاندنێکی ناوەکی خۆی دەدات بە دەستەوەوە. واتە بۆ هەڵسەنگاندنێکی ئەدەبییانە و پێوەرەکانی شیعرناسیی و ئێستاتێکی بەسەریدا زاڵ دەبێ و بوارەکانی سیاسەتی لێ جودا دەکرێتەوە. ئەم گۆڕانکارییانە، لە رووی واتاییەوە، کاریگەرییەکی زۆری بە سەر ناوەڕۆکی کۆنکرێتی "کردەی کلاسیزم"ەوە بەجێدەهێڵێ. راستە، دروستبوونی "کلاسیسزم"ی فەڕەنسی وابەستەی هەلومەرجی تایبەتییە کە لە سنووری نیشتیمانی فەرەنسییاندا دێتە بەرهەم، ئەمەش رێگا لەوە ناگرێت لە چوارچێوەیەکی فراوانتر و گشتیتردا بخوێندرێتەوە، چونکە ئەم دووبارە پێناسەکردنەوە و خوێندنەوەیە لە ئاستی وڵاتە گەورەکانی ئەورووپادا، هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی پێکردووە.

لە ساڵی ١٨٠٠دا، فریدریك شلێگل لە یەکێك لە گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمە ( گێشپراخ ئوبەر دی پۆیەزی) ئاماژە بۆ چەمکێکی لاتینی دەکات، ئەویش " ئائێتاس ئاورێئا" کە" مۆدێرنەکان لەم رووەوە شوێنپێی رۆمانەکانی هەڵگرتووە"، لەم رووەوە "هیچ میللەتێك نەیانویستووە لە دەرەوەی ئەم " ئائێتاس ئاورێئا "یە بن، واتە لە دەرەوەی "چاخی زێڕین"دا بن". بەو پێیە، شلیگل، دەیەوێ ئاماژە بۆ خاڵێکی بنەڕەتی بکات، ئەویش هەلومەرجی مێژووییە، وای لە میللەتان کردووە، ئاوڕ لە چەمکە دێرینەکان بدەنەوە بۆ ئەوەی بەهای نیشتیمانی ببەخشنە ئەدەبەکەیان، بەهایەکی دانسقە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێو مێژووی ئەدەبییاتی نیشتیمانی کە بە بێ وچان لە سەدەی نۆزدەهەمدا گوڕ و تینی وەردەگرت، دووبارە بەرهەمهێنانەوەی تەقلیدە ئەدەبییەکان لە پێناو بەرهەمێنانی لوتکەدا بەکار دەهێنرێت، وەکو وێنەیەك کە لاساییکردنەوە مەحاڵ بێ، زۆرجاریش نۆرم و دەستوور و رێساکانیشی لە گەڵ خۆی هێناوە، وەکو نموونەی فەرەنسی. جا ئەگەر "سێ سەدەی" ئیتالیایی بووبێ، یا "قۆناغی ئێلیزابێت"ی ئینگلیزیی، یا " گودێن ئیۆ"ی هۆڵەندی، یا "قۆناغی زێرین"ی ئیسپانی، یا سەردەمی "کلاسیك"ی ئەڵمانی، ئەم دیاریکردنە روون و ئاشکرایە، ئەویش بەهادانە بە ئەدەبی نیشتیمانی و لە سەر بناغە و پێوەری هەرەمی. ئەم قۆناغ و سەردەمانە لە ژێر تەکامول و پێگەیشتنێکی ئێستێتیکانە و باڵادەستی کەلتووریدا دەناسرێنەوە.





ئەم دیارییکردنە کەم تا زۆر تەعەسووفییە، مێژووی ئەدەب بە کوتلە و بلۆکی یەك لە دوای یەك کە ئاماژە بۆ کەڵە نووسەر و هەڵبژاردن و جیاکردنەوە ئەم نووسەر و ئەو نووسەرانە لە سەر بنەمایەك کە وابەستەی فیکرەی "گەشەسەندن"ە لە ژێر رۆشنایی مۆدێلی سەرهەڵدان و ئاوابوون، لە ژێر رۆشنایی مۆدێلێك کە لاساییکردنەوەی مەحاڵ بێ، تەنانەت ئاماژەکردن بۆ نۆرم و رێساگەلێکی نموونەیی. لە هەموو بارێکدا، ئەم بەهاپێدان و هەڵسەنگاندنە، دواتر خۆی دەردەخات، واتە دوای ئەو قۆناغانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیان بۆ کرا، ئەم ساغکردنەوە و هەڵسەنگاندنانە زۆر جار مشتومڕ و ململانێی سەختی لە گەڵ خۆی هێناوەتە گۆڕێ. لە هەموو بارێکیشدا، ئەم کێشمەکێشانە بە شێوەیەکی کەم تا زۆر یەکدیگر، هێور دەبنەوە. بەوە کۆتایی دێت کە گوتارێك دەهێنێتە کایەوە کە کەم تا زۆر ئیجیماعی لەسەر دەکرێ، ئەویش ئەو پێداگرییە کە دەیەوێ رابردوو کۆنترۆڵ بکات، واتایەکی پێ ببەخشێ و بەهایەکی عەمەلی بداتێ.

مۆدێلێك بۆ تێپەڕاندن : "کلاسیزم"ی فەرەنسی

پێش هاتنەکایەوەی تێرمی "کلاسیزم" هەموو دەزانین "سەدەی لویسی مەزن"هەبوو. ئەم دەستەواژەیە لە ساڵی ١٦٧٠ پەیدا بوو و یەکەمینجاریش لە لایەن پێرۆ-ەوە جەختی لەسەر کرا، ئەویش لە کاتی سەرهەڵدانی "دەمەتەقێی نێوان کۆن و مۆدێرنەکانەوە" کە لە گەڵ "سەدەی ئۆگویست" لە لایەن پێرۆ و چەندین نووسەری دیکەوە بەراورد دەکرێت، ئاماژەکردنێکە بە بەهاپێدانێکی بێوێنەی ئەدەبییاتێك کە لە "ئێستا"دا پراکتیزە دەکرێت کە دواتر بە "کلاسیزم" نێوزەد دەکرێت. شایانی روونکردنەوەیە کە لەو قۆناغە دوو بەرە رووبەرووی یەك بوونەوە : بەرەیەك کە بەرگریان لە ئەدەبی کلاسیکی ئەنتیکیتێ دەکرد و وەکو مۆدێلی خۆیان سەیریان دەکرد و پێ داگرییان لە لاساییکردنەوە ئەو ئەدەبە دەدا و بە لوتکە پێناسەیان دەکرد کە تێپەڕاندنی مومکین نییە، ئەم بەرەیان بوالۆ سەرکردەی دەکرد. بەرەوی دووەم ئەدەبییاتی ئەنتیکیان وەکو مۆدێل نەدەبیی و پێزانینی خۆیان دووپات دەکردەوە بۆ باڵایی و باڵادەستی ئەو ئەدەبە، بەڵام پێداگرییان لەوە دەکرد کە تێپەڕاندنی مومکینە ؛ ئەم بەرەیان لە لایەن پیرۆوە سەرکردایەتی دەکرا. نێوزەدکردنی رێبازێکی ئەدەبی لە ژێر دەسەڵاتێکی دیاریکراودا، دەنگوسەدای تایبەتی

خۆی پەیدا دەکات، نەك تەنها لە فەرەنسا، بەڵکو لە ئەڵمانیا و لە ئیسپانیاشدا. ئەم نێوزەدکردنەوە خۆی لە خۆیدا هەڵگری دوو دەلالاتی قووڵە : ئەممەش بە کورتی زاڵکردنی سەروەری بواری سیاسەتە بە سەر بواری کەلتووریدا. سەرباری ئەوەی بەهابەخشینێکی نوێیە کە دەدرێتە بواری کەلتووری، جەختکردنە لە سەر ئەوەی کەلتووری هاوچەرخ لە ژێر سایەی حوکمڕانێکدا دەخەملێت و دەگەشێتەوە. کەواتە چەمکی "کلاسیزم" هیچ واتایەکی نییە، نە ئاماژە بۆ بەهایەکی ئەدەبی سەربەخۆ دەکات وەکو دواتر ئاماژەی بۆ دەکات، نە شەرعیپێدانیکی پۆێتۆلۆگی دیاریکراو لە ژێر سایەی مەرجەعگەلێکی ئەنتیکدا، واتە دێرین، مەبەست لە مەعریفەی دێرینی یۆنان و لاتینی دێرینە. وێڕای ئەو هۆکارانەی کە لە نێو خودی گفتوگۆ و دەمەتەقێیەکاندا، نووسەری هاوچەرخەکان ناتوانن ببنە نووسەری "کلاسیك"، نە سەبارەت بە "مۆدێرنەکان"یشەوە، ئەوانەی جەختیان لەسەر پێشڕەویی و باڵادەستی ئەدەبییاتی هاوچەرخیان دەکرد، نە بە گوێرەی "دێرینەکان"یشەوە، چونکە ئەوان کلاسیك تەنها لە چاخە ئەنتیکەکان دەبینن ( یۆنانی دێرین و لاتینی). ئەوەی بە شێوەیەکی گشتگیر لە سەدەی حەڤدە لە هەموو لایەکەوە قبووڵ دەکرێت، پێناسەی قوتابخانەییە، ئەمە رەچەڵەکی ئەم چەمکەیە کە کاریگەرییەکی زۆری دەبێ، هەروەها پێناسەیەکی مێژوویی و نۆرامتیڤیش هەیە کە فەرهەنگی فویرتییەر لێکیدەداتەوە : دەڵێ مەبەست لە بەرهەمی ئەو نووسەرانەیە کە لە قوتابخانە دەخوێندرێن، یا مەبەست لەو نووسەرانەیە کە لە سەردەمی کۆماریی ژیاون، مەبەست لە سەردەمی کۆماریی لاتینییە. ئاماژەیەکیشە بۆ حوکمڕانیی ئیۆگوست کە زمانی لاتینی گەیشتبووە قۆناغی هەرەتی.

ئەگەر "سەدەی لویسی مەزن" لێواولێوی خەون بێ، لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەمدا خۆی ساغ کردەوە و بوو بە "سەدەی ئیۆگۆستی"نوێ، هەر وەکو پێرۆ لە دوو دێردا بەمجۆرە باسی لێوە دەکات و دەنووسێ :" بە بێ ترس دەتوانین و بە بێ ئەوەی نا ئینسافی بکەین/بڵێین سەدەی لویستی حەڤدە، وەك سەدە جوانەکەی ئیۆگۆستە"، ئەمە نابێتە هیچ پاساوێك بۆ ئەوەی ناوی "کلاسیزم" هەڵگرێ.

سەدەی حەڤدە، سەدەی گەشەسەندن و سەرهەڵدانی ئەدەبێکی دانسقەیە، هێشتا پەیوەندی بە نۆرماتیڤێکی نموونەیی و تاق دەگمەنەوە نییە. بە پێچەوانەوە، لە نێو ئەو مشتومڕ و دێباتانە، دژ بە جیهانبینی سەروونیشتیمانییەوە کە دەرهاویشتەی فیکری ئیومانیسم بوو، فیکرەیەك کە جەخت لە سەر دانسقەیی ئەدەبییاتێك دەکات کە مۆرکی نیشتیمانی هەڵگرتبێ. ئەم بیرۆکەیە لە سەدەی هەژدە جەختی لەسەر دەکرێ، بۆ نموونە





لە لای ڤۆلتێر کە بیرۆکەکە لە یەکێك لەبەرهەمەکانی لە ژێر ناونیشانی "سەدەی لویسی چواردە" چەند توخم و رەگەزێکی بەکاردەهێنێ و ئاماژە بۆ ئەو بنەما سیاسییە دەکات کە پێرۆ هێنایە کایەوە، بۆ ئەوەی باس لە سەرهەڵدانی کەلتووری دەکات کە تا ئەو دەمە بەردەوامیی هەبووە.
لە بەرئەنجامی ئەو نووسینە، ڤۆلتێر ویستوێتی باس " لە گەشە سەندنی هزری ئینسانی لە لای فەرەنسییەکان بکات، لە چەرخەی کە لە گەڵ کاردینال دو ریشلیۆ دەست پێدەکات و کە لەم چەرخەی ئێمە کۆاتیی دێت." سەرباری ئەوەی کە ڤۆلتێر لە نووسینەوەی ئەو کتێبە ویستوویەتی، روویەکی رەخنەئامێز بداتە ئەو بەرهەمە لە پێناو ئەوەی رەخنە لە ئێستا بگرێ، بەڵام رۆڵ و خەسڵەتەکانی چەرخی رۆشنگەرییش فەرامۆش ناکات کە بەهار تەکامولخوازی داوەتێ. ئەم بۆچوونە، تەنانەت لە کاتی نووسینی بابەتێك لەمەڕ "کلاسیزم"ەوە بۆ ئەنسیکلۆپیدیا ئامادە دەکرێ، شوڤالییە دو مارێ کە نووسەری ئەو بابەتەیە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە "ناوهێنانی نووسەرە فەرەنسییەکانی کلاسیك، نووسەرە چاکەکانی سەدەی حەڤدە و ئەم سەدەیەن، مەبەست لە سەدەی هەژدەمە."
ئەگەر لەو نووسینە دەستەواژەی"کلاسیك" ئاماژەیەکیش بێ بۆ "نووسەرانی مۆدێرن کە دەکرێ لە پاڵ ئەو مۆدێلەوە دابنرێن کە خاوەن ستایلێکی جۆانن" وەکو ( راسین وبوالۆ) و ئەگەریش بەم پێیە نۆرمەکان ئەدەبییاتی نیشتیمانی بە روونی ئاشکرا دەبن، دواتر دەبێتە کارێکی جەوهەریی بۆ دەسنیشانکردنی "ئۆپێراسیۆنی کلاسیسزم"، کەچی ئەم بەچەمکردنە تووشی تەگەرە دەبێ لەبەر بوونی ئیمکانییەتێك لەمەڕ گریمانی ئەوەی کە پێشکەوتن و گەشەسەندنی بەرهەمی ئەدەبی بە شیاو دەبینرێ (" نووسەرانی چاکەکانی سەدەی لویسی چواردە و ئەم سەدەیە"). ئەو ئیرادەیەی کە لە پشتی پێکهان و دروستکردنی هەرەمێکە کە پەیوەست بێ بە ئەدەبی دانسقەی نیشتیمانییەوە  هێشتا هەموو بنەچە و بناغەکانی لە رابردووەوە نایەن، تەنانەت ئەم دانسقەییە وەکو بەرهەمی عەقڵ تەماشا دەکرێ. بە گوێرەی مارێ، نووسەری بابەتی کلاسیزم بۆ ئەنسیکلۆپێدیا، ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە "نووسەری کلاسیك" کە ئەم نووسەرانە لە نووسەرە هەرە چاکەکانی نیشتیمانن و  لە هەرە منەوەر و هەرە بە ئەدەبەکانن".




# شۆڕش یان ویستی ئازادی و تێکشکاندنی واقیع

خوێندنەوەیەکی فەلسەفیی مێژوویی بۆ ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان)ی (کاروان عومەر کاکەسوور)



سۆران ئازاد

پێشەکی

هۆشیاریی مێژوویی یەکێکە لەو ئێڵەمێنتە کاریگەرانەی، کە بەردەوام لای داهێنەرە گەورەکانی جیهان ئاڕاستەی سەرەکی و گرنگن بۆ بینینی دنیا بە شێوەیەکی جیاوازتر لەوانی دی. ئەو هۆشیارییە بە تەنیا خۆی لەوەدا نابینێتەوە، کە مێژوو یان ڕابردوو وەك خۆی بهێنرێتە ناو تێکستی ئەدەبی یان هونەری،



بەڵکو ئەرکی هەرە گەورەی ئەو هۆشیارییە تێکشکاندنی مێژوو و بۆچوونە باوەکانیەتی، چونکە ئەو تێکشکاندنە یەکسانە بە هەڵوەشاندەوەی بۆچوونە باوەکان و واقیعی هەنووکەیی، کە وا دەکات قووڵتر و کاریگەرتر لە ئێستا و داهاتوو تێبگەین. مادام نووسەر بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، ئەوا بەردەوام لەژێر کاریگەریی ئەو کۆنسێپت و ڕووداوانەدا دەبێت، کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆی و دەوروبەری ڕوویان داوە و ڕوو دەدەن. ئەو کاریگەرییە چەندە پرۆژەیەکی ڕۆشنبیری بێت، هێندەیش هەوڵێکی وجودیانەیە بۆ دۆزینەوەی پێوەندیی نێوان نووسەر بە خۆی و جیهانەوە. نووسەر بوونەوەرێك نییە لە دەرەوەی ئەوانی تردا بژیێت، بەڵکو ئەوانی تر بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر نووسەر دروست دەکەن، بۆیە نووسەر بەشێکە لە مێژووی ئەوانی دیکەیش. ئەو داهێنەرانەی ئیشیان لەسەر ڕووداوەکانی مێژوو کردووە هێندەی هەوڵی تێکشکاندنی مێژوویان داوە، هێندە هەوڵی ئەوەیان نەداوە مێژوو وەك خۆی بهێننە ناو تێکستی ئەدەبی. ئیشی ئەدەب گێڕانەوەی مێژوو یان ڕابردوو نییە وەك ئەوەی، کە هەبووە، بەڵکو پێشاندانی ئەو دیوە شاراوانەیە، کە پاڵنەری دروستکردنی مێژوون. بۆ نموونە ئەگەرچی زەمەنی ڕووداوەکانی ڕۆمانی (جەنگ و ئاشتی) ئاماژەن بە داگیرکاریی فرەنسا بەسەر ڕووسیادا، بەڵام (تۆڵستۆی) نەهاتووە ئەو مێژووە بگێڕێتەوە، بەڵکو باسی ژیانی پێنج بنەماڵەی ئەرستۆکراتیی ڕووسی دەکات لەو زەمەنەدا، تەنانەت بەشێك لە دیالۆگی نێوان کارەکتەرەکانی ئەو ڕۆمانە بە زمانی فرەنسییە، کە ئەو تەکنیکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ مێژووی ئەو کاتی ڕووسیا دەخاتە ڕوو، بەوەی دەبووایە خەڵك زمانی فرەنسییش بزانن، چونکە بووبووە زمانی فەرمیی کاروباری دەوڵەت. ئەو جۆرە مامەڵەکردنە نەك بە تەنیا لای (تۆڵستۆی) هەیە، بەڵکو لای زۆربەی ڕۆماننووسە گەورەکانی جیهان مێژوو یان ڕابردوو بە شێوەیەکی جیاوازتر لەوەی هەیە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. بە ئاسانی ئەو جۆرە ئیشکردنە لای (دۆیستۆڤسکی)، (ڕۆسۆ)، (جۆرج ئۆرۆیڵ)، (مارکیز) و زۆر ڕۆماننووسی تر دەبینرێت. (جۆرج ئۆرۆیڵ) لە ڕۆمانی (**1984**) و (کێڵگەی ئاژەڵان)دا مێژووی وەك خۆی نەگێڕاوەتەوە، بەڵکو ئیشی لەسەر ڕووداوەکانی مێژوو کردووە بە دیدێکی ڕەخنەگرانە. بۆ نموونە لە نۆڤلێتی (کێڵگەی ئاژەڵان)دا هیچ کات باسی (لینین) و (ستالین)

ناکات، بەڵکو باسی شۆڕشی کۆمەڵێك ئاژەڵای ماڵی دەکات دژ بە خاوەنە دڵڕەقەکەیان، بەڵام لە ڕێگەی فیکشنەکانی ڕۆمانەکەوە خوێنەر بە ئاسانی لەوە تێدەگات، کە لەو ڕۆمانەدا چۆن ئیش لەسەر شۆڕشی سۆسیالیزمیی ڕووسیا کراوە و دەرئەنجامەکانیشی چەندە پێچەوانەی بانگەشەکانن.

لەبەر ئەوەی مێژوو هەیە، بەردەوام ڕووبەڕووی کێشەی ڕابردوو بە ئێستا و داهاتووەوە دەبینەوە. پرسیاری ئەوەی، کە ئایا ڕابردوو شتێکی مردووە و تێپەڕیوە یان زیندوو و چالاکە ئاراستەی ژیانی ئێستا و داهاتوویشمان دیاری دەکات؟ بۆ نزیکبوونەوە لە وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستیمان بە دیدی ئێستامان هەیە بۆ ڕابردوو، چونکە تا ئەو کاتەی ڕابردوو، کە مەبەستمان مێژوویشە دیدی ئێستامان ئاراستە بکات و بڕیاریش لەسەر داهاتوومان بدات، مانای وایە ڕابردوو ئاراستەکردنی ئێستا و داهاتوویشە. ڕابردوو، کە مێژووی سەرتاپێی بوونمان لە خۆی دەگرێت بەردەوام کێشەیەکی گەورەی فەلسەفی بووە. ئەو کێشەیە ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە زەمەن و شوێنەوە هەیە، چونکە مێژوو تۆڕەکانی خۆی لەناو زەمەنە جیاوازەکاندا بڵاو دەکاتەوە... بۆیە کردنەوەی کۆدەکانی مێژوو بەردەوام یەکێکە لە ئاراستە قووڵەکانی بیرکردنەوە. (ئێدوارد سەعید) لە کتێبی (کەلتوور و ئیمپڕیالیزم- Culture and Imperialism) ئاماژە بە پێوەندییەکانی ڕابردوو بە ئێستاوە دەدات و پێی وایە ، کە وروژاندنی پرسیاری پێوەندیی نێوان ڕابردوو بە ئێستا و داهاتووەوە تەنیا پێوەندیی بەوەوە نییە، کە چی لە ڕابردوودا ڕووی داوە و ڕابردوو خۆی چییە، بەڵکو پرسی سەرەکی ئەوەیە، کە بە ڕاستی ڕابردوو ڕابردووە و تەواو بووە یان بەردەوامە و لە فۆڕمی جیاوازدا کاریگەریی و پێشەنگیی خۆی بۆ ئێستا و داهاتوو دەردەخات؟ هەر لەو کتێبەدا (سەعید) پەنا بۆ بۆچوونی (ئیلۆت)ی شاعیر دەبات، کە پێی وایە هەستێکی مێژوویی (Historical sense)سەرتاپێگیر و تێکشکێنەری زەمەن هەیە، کە وا دەکات نووسەر ببێت بە بوونەوەرێکی ترادسیۆنی بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت. هەر ئەوەیشە وا دەکات نووسەر هۆشیارییەکی گەورەی بەرانبەر بە شوێن و زەمەنی ئێستای هەبێت.

ئامانجی سەرەکیی ئەم باسە ئیشکردنە لەسەر ئەو هۆشیارییە مێژووییەی، کە لە ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان)ی (کاروان عومەر کاکەسوور)دا ڕەنگی داوەتەوە. گرنگیی ئەو ڕۆمانە بۆ ئەم باسە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە، کە ڕابردوو وەکو کەرەستەیەکی ئەبستراکت و تێپەڕیو مامەڵەی لەگەڵدا نەکراوە، بەڵکو لە زمانی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیشدا هەمیشە دەمی ئێستا (Present tense) بە کار هاتووە.





ئەمەیش هەوڵێکی هونەرییانەیە بۆ هێنانەوەی ڕابردوو و تێکشکاندنی. زەمەنی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لە هەرەسی شۆڕشی ئەیلوولەوە دەست پێ دەکات و تا زەمەنی دوای ڕاپەڕین درێژ دەبێتەوە. ئەم ڕۆمانە هەڵگری چەندین ڕووداو و سەربردەی جیاوازە، کە دیوی شاراوەی مێژووی چەندین ساڵەی کۆمەڵگای کوردی و واقیعی کەلتووری خۆرهەڵات پێشان دەدات.

یەکەم چاپی ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) لە ساڵی **2011** یە، کە لە لایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە چاپ کراوە. جگە لەو ڕۆمانە، (کاروان کاکەسوور) لە کۆمەڵە چیرۆکی (ئەسپیدیلۆن) بە تایبەت لە چیرۆکی (خێو)دا ئیشی لەسەر ئایدیای تێکشکاندنی شۆڕش کردووە. کاریگەرییەکانی ئەو ڕۆمانە بە ئاسانی لە بەرهەمەکانی دوای خۆیدا دەبینرێت، بەڵام سەرچاوەی ئایدیای تێکشکاندنی شۆڕش بەردەوام تێمایەکی سەرەکیی بووە لە بەرهەمەکانی (کاروان کاکەسوور)دا، بۆ نموونە لە ڕۆمانی (مامزێر) و (سوارەکان بە قاچاغ بووکیان گواستەوە)دا بە چەند ئاڕاستەی جیاواز ڕووبەڕووی شۆڕش و تێکشکانی شۆڕش دەبینەوە. بەڵام ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیە مەبەستمانە سەرنجدانی ڕووداوەکانی ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان)ە.

ئەو ڕۆمانە چوار کەناڵ لە خۆی دەگرێت، کە گێڕەرەوەی کەناڵی یەکەم و سێیەم (ئامانج)ە و گێڕەرەوەی کەناڵی دووەم (ئازادی هەمین مامان) و گێڕەرەوەی کەناڵی چوارەمیش (سۆزان)ە. کۆتایی ڕۆمانەکەیش (فەرهەنگی کارەکتەرەکان)ە، کە تەکنیکێکی نوێی (کاروان کاکەسوور)ە و تێیدا نووسەری ئەو ڕۆمانە دەبێتە یەکێك لە کارەکتەرەکان و سەربردەی کارەکتەرەکانی لەو بەشەدا دەخاتە ڕوو، بەهۆی ئەوەی کچی یەکێك لە کارەکتەرەکان پاش ئەوەی ئەو ڕۆمانە دەخوێنێتەوە پێوەندیی بە نووسەرەکەوە دەکات و داوای لێ دەکات کۆتایی چیرۆکەکانی پێ بڵێت.

ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لە هەرەسی شۆڕشەوە بۆ دروستبوونی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ڕوو دەدەن، کە پاڵنەری سەرەکیی ئەو ڕووداوانە ویستی قووڵی کارەکتەرەکانە بۆ ئازادی و تێکشکاندنی واقیعی باو، بەڵام ڕووداوەکان مەرج نییە دەرئەنجامی پلانێکی پێشوەخت بن، بەڵکو ئاماژەن بە هەوڵی کارەکتەرەکان بۆ دەرچوون

لە خۆیان و واقیعی دەوروبەریان.

## چەمکی شۆڕشی باو

ڕووداوەکانی ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) دەکەونە نێوان هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول و دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ. کارەکتەرەکان بۆ دوو لا دابەش دەبن. بەشێکیان ئەوانەن، کە بەشداریی شۆڕشی ئەیلوولیان کردووە و تەنانەت هەندێك لەوانە لە شاخ ژیاون وەکو (دلارام)، (هەتاو)، (شۆڕش)، (مام ئەنوەر)، (سۆزان)، (هەژار)، (فەرەیدوون)، (گوڵدان) و زۆری دیکە. بەشێکی تریان ئەوانەن، کە بەشداریی شۆڕشی ئەیلوولیان نەکردووە، بەڵام پاڵنەری ڕاستەوخۆی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێن لەوانە (شێرزاد ناجی)، (دلێر جەلیل)، (ئازادی هەمین مامان)، (دانا تەڵعەت)، (ئاواز)، (ئامانج) و کۆمەڵێکی تر، بۆیە ژینگەی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە ژینگەیەکی شۆڕشگێڕانەیە و کارەکتەرەکان لە زۆر شوێندا بەبێ ئەوەی خۆیان بیانەوێت بەشدارییان لە دروستکردنی ئەو ژینگەیەدا هەیە. کاتێك دەوروبەریان هەژانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەخۆیەوە دەبینێت، هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کارەکتەرەکان ڕووبەڕووی هەمان هەژان دەبنەوە. هەر لەبەر ئەوەیشە بوونی کارەکتەرەکان بەو واقیعە شۆڕشگێڕانەوە دەبەسترێتەوە.

پرساری سەرەکی ئەوەیە ئایا شۆڕش چییە و چ هۆکارێك وا دەکات شۆڕش ببێتە پێویستییەکی واقیعی؟ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ڕووبەڕووی زۆرترین کێشەی فکریمان دەکاتەوە، چونکە پێناسی شۆڕشی بە درێژایی ڕەوتی مێژوو گۆڕانی گەورە و دژبەیەکی بە خۆوە بینیوە. لای (کارڵ مارکس) شۆڕش پێوەندیی بە جیاوازیی چینایەتی کۆمەڵگاوە هەیە، کە ئەو جیاوازییە دەرئەنجامی کۆنترۆڵکردنی ئامراز و شمەکەکانە لە لایەن چینێکی دیاریکراوەوە. هەر ئەو کۆنترۆڵکردنەیە جیاوازیی ئاستی پلەبەندی کۆمەڵایەتی (Social Class Hierarchy) دروست دەکات. چینی داگیرکەر دەست بەسەر هەموو پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان دادەگرێت و هەر ئەوەیشە سەرمایەداری (Capitalism) دروست دەکات. بێبەشکردن یان قورسکردنی دەستخستنی پێداویستییەکانی چینی خواروو و کرێکار زەمینە بۆ ململانێ (Conflict) خۆش دەکات، کە وا دەکات بەرژەوەندیی چینی بۆرژوازەکانیش بکەوێتە ژێر مەترسییەوە. هەر بۆیە لە شۆڕشی پیشەسازیدا بۆرژوازەکان شوێنی ئەرستۆکراتەکانیان گرتووەتەوە وەك





چۆن پرۆلیتاریەت (**proletariat**) شوێنی چینی کرێکار (**Worker class**)یان گرتووەتەوە. بەم شێوەیە لە سەرمایەداریدا تاکەکان لەژێر سیستەمێکی زۆر نادادپەروەرانەدا دەژین و چینی ئیشکەر هەژارتر و چینی بۆرژوازەکانیش دەوڵەمەندتر دەبن. هەر ئەوەیشە وا دەکات چینی کرێکار هەست بە نامۆبوون (**Alienation**) بکات، کە دۆخی هەستکردنە بە گۆشەگیری و بێدەستەڵاتی. لەو ڕوانگەیەوە گۆڕانی ئەو دۆخە تەنیا بۆ شۆڕشی سۆسیالیزم دژی بە کەپیتاڵیزم دەکرێت. بۆیە شۆڕش دەبێتە پێویستییەکی واقیعی بۆ ئەوەی کرێکارەکان دژ بەو دۆخە نایەکسانییە بوەستنەوە. کەواتە لای (کارڵ مارکس) شۆڕش گۆڕین و دژەوەستانەوەی سیستەمی کەپیتاڵیزمە.

مەبەستمان لە باسکردنی دیدی (مارکس) بۆ شۆڕش ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە بەشێکی زۆری ڕووداوەکانی ئەو ڕۆمانەوە هەیە، چونکە سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ لە ساڵی **1975**، کە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) فیگەری سەرەکییەتی پانتایی سەرەکیی ڕووداو و مێژووی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆمانە داگیر دەکات. لە کەناڵی دووەمدا، کە لەژێر ناونیشانی (بڕینی پارچە گۆشتە ژەهراوییەکان)دایە و گێڕەرەوەی سەرەکی (ئازادی هەمین مامان)ە، باس لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) دەکرێت، کە (شێرزاد ناجی) فیگەری سەرەکیی ئیشەکانی ئەو بزووتنەوەیە لە (هەولێر) دا، کە چەقی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆمانە لە خۆ دەگرێت. (شێرازد ناجی) ڕۆشنبیرێکی ئایدۆلۆجیی یاخییە و هەموو ڕێگاکان بۆ دروستکردنی لایەنگر بۆ ئەو بزووتنەوەیە بە کار دەهێنێت. دیدی (شێرزاد ناجی) بۆ پارە لەژێر کاریگەریی دیدی (مارکس)دایە. ئەوەتا ئەو کاتەی، کە (دایە ڕوقیە)، کە ژنی (مەلا عارەب عەبدولسەمەد) و دایکی (دەرسیم کوردۆ)یە، دوای ئەوەی کوڕەکەی لە مەلای باوکی یاخی دەبێت و پێوەندیی بە شۆڕشەوە دەکات، لە ڕێگەی (ئازاد)ەوە دەیەوێت پارەی بنێرێت، بەڵام (ئازاد) لەبەر ئەوەی هیچ هەواڵێکی (کوردۆ)ی لا نییە پارەکەی لێ وەرناگرێت، (شێرزاد ناجی) لە (ئازاد) توڕە دەبێت و دەڵێت:

"مەگەر ئەو پارەیە هەر هیی ئەو خەڵکە نییە، کە ڕژێم بەهەزار ڕێگای جۆراوجۆر لێیان دەستێنێت و دەیداتە

پیاوانی ئایینی...؟!"

لێرەدا (شێرزاد ناجی) ئاماژە بە (پارە)، (خەڵك)، (ڕژێم)، (هەزار ڕێگای جۆراوجۆر)، (لێیان دەستێنێت)، (دەیدات) و(پیاوانی ئایینی) دەكات، كە بە وەستان لەسەر هەر یەكێك لەو وشانە دەتوانین چەندین خوێندنەوەی جیاواز بكەین. لای (كارڵ ماركس) سەرمایە، كە مەبەستی (پارە)یشە سەرچاوەیەكی گشتییە واتە هیی (خەڵك)ە، ئەو سەرمایەیە، كە لە لایەن (ڕژێم)ە جۆراوجۆرەكانەوە بە چەندین (ڕێگای جۆراوجۆر) لە (خەڵك) (دەستێنرێت) تەنانەت بە بێ ئەوەی (خەڵك) هەستی پێ بكات. كڵێسەیش، كە (پیاوانی ئایینی) لە خۆ دەگرێت، هەمان ڕۆڵیان لە بەكارهێنانی سەرمایەی (خەڵك)دا هەیە. كەواتە ئەوەی لە بەرژەوەندیی دەدرێت بریتییە لەو (خەڵك)انەی لە چینی خوارەوەن.
بەڵام لە پەرەگرافی دوای ئەوە هاتووە:
" هەر هێندەت لە دەست هات، كە بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبارەی ماڵی مەلاوە هەتبوون، بۆی ڕوون بكەیتەوە، بەشێكی ئەو پارەیە كچەكانی مەلا بە دروومان پەیدای دەكەن، چونكە باوكیان لەگەڵ چەند بەرگدرووێكی ناو قەیسەریدا ڕێك كەوتووە جلی موشتەرییەكانی خۆیان بۆ ئەمان بهێنن و ئەوانیش پارچەی بە نرخێكی كەم دەدوورن... ئێواران دوای نوێژی شێوان مەلا خۆی پارچەكان لە بەرگدرووەكان وەردەگرێت و بۆ كچەكانی دەباتە ژووری... لەوسەریش جلە دووراوەكان دەهێنێت و هەق و حیسابیان لەگەڵدا دەكات... (شێرزاد ناجی) لەمەوە زیاتر هەڵچوو و بەوە تاوانباری كردیت، كە تۆ لەگەڵ چەوسانەوەی ژندایت... لەگەڵ ئەوەدایت ئەو كچانە لە كونجی ژوورەوە ئارەق بڕێژن و ڕەنجیشیان بۆ مەلا بێت... لە لایەكی دیكەوە ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگرتیت، گوایە تۆ هیچ لە ئامانجەكانی ئەو شۆڕشە تێناگەیت، كە كۆتایی بە هەموو شێوە چەوسانەوەیەك دەهێنێت... پێی لەسەر ئەوە دادەگرت، كە ئەوان تا لە توانایاندا هەیە دەبێت ئەو پارەیە لەژێر دەستی مەلا دەربهێنن و بیخەنە خزمەتی شۆڕشی چەوساوەكانەوە... "
یان لە شوێنێكی تردا (شێرزاد ناجی) دەڵێت:
" ئەزموون فێری كردم، كە تەنیا خەباتی چینایەتییە كوردستان ڕزگار دەكات و چەوسانەوە ناهێڵێت... "
لەو دوو پەرەگرافەدا تەواو بۆمان دەردەكەوێت، كە ئامانجی سەرەكیی ئەو شۆڕشەی (شێرزاد ناجی) ئاماژەی پێ دەدات هەمان ئەو شۆڕشە كۆمۆنیستەیە، كە (لینین)،





(ستالین) و (ماو) بانگەشەیان بۆ دەکرد. پێشڕەوی شۆڕشی کرێکاری (لینین)ە. دەرکەوتنی (لینین) پێوەندیی بە کۆتایهاتنی نیکۆلاسی دووەمەوە هەیە، چونکە (لینین) توانی تووڕەیی بکات بە ئامرازی سەرەکی بۆ دەستخستنی دەستەڵات. چاوەڕوانییەکی گەورە لە (لینین) دەکرا، وەك هەموو ئەو چاوەڕوانییە گەورانەی بە درێژایی مێژوو لە هەر بزووتنەوەیەکی سیاسی کراوە.

هەر لەو کاتەدا بوو، کە (بۆلشڤیەکان) بوون بە دەستەڕاستی (لینین)، ئەگەرچی ئەوان لە هەڵبژاردن سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام (لینین) ئەنجامەکانی گۆڕی.

لێرەدا (شێرزاد ناجی)، کە فیگەری سەرەکیی شۆڕشگێڕانەی ڕۆمانەکەیە، شۆڕشی چینایەتی، کە مەبەست لێی کۆمۆنیزمە بە تاکە چارەسەر بۆ کێشەکانی کوردستان دەزانێت. ئەو بۆچوونە لەو زەمەنەدا، کە دروستبوونی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ە لەژێر کاریگەریی ڕەوتی شۆڕشگێرانەی جیهاندایە، کە دواجار بە کەوتنی ڕووسیای سۆڤیەت ئەو ڕەوتە ڕووبەڕووی لاوازییەکی بەرچاو دەبێتەوە. ئەوەی پێویست دەکات تێگەیشتنە لە ئامانجی شۆڕش و بەکارهێنانی ڕێگاکانی گەیشتنە بە ئامانج بۆ ئەوەی بزانین چۆن لەو ڕۆمانەدا بەرجەستە کراوە.

جگە لە بوونی ڕژێمی بەعس، تارمایی ئایین لەسەر فەزای ڕووداوەکانی ئەو ڕۆمانەدا هەمیشە ئامادەیی هەیە و بە چەندین ڕێگەی جیاواز خۆی دەنوێنێت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە، کە بزانین ئایدۆلۆجیای ئەو شۆڕشە چۆن ڕووبەڕووی ئەو ڕووداوانە دەبێتەوە، کە ئایین پاڵنەری سەرەکییانە، چونکە ئایین لە کەلتوور و مێژووی کوردییدا هەمیشە ئامادەییەکی گەورەی لە بیرکردنەوە و پاڕادایمی ژیانی تاکەکاندا هەبووە.

بۆ شۆڕشی کۆمۆنیزمیش بەرگریکردن لە ئایین ئیشی کۆنسەرڤاتیڤەکانە. یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو ڕۆمانە ڕاکردنی (ئیمان)ی کچی (مەلا عارەب عەبدولسەمەد)ە بۆ لای (عیماد)، کە پەیمانی خۆشەویستیان لەگەڵ یەکدا بەستووە. کاردانەوەی (شێرزاد ناجی) وەك لە پەرەگرافێکی ڕۆمانەکەدا هاتووە بەو شێوەیە:

" دوای ئەوەی هەواڵەکەیش بە هۆی (پڕوپاگەندە شۆڕشگێڕییەکە)ی (شێرزاد)ەوە بە گەڕەك و شاردا بڵاو بووەوە، هەموو موسڵمانە ڕاستەقینەکان دەیانویست یارمەتیی مەلا بدەن و لەم نەهامەتییە ڕزگاری بکەن... مەلا

خۆیشی پێی گوتبوون، کە خوای گەورە دەیەوێت تاقیی بکاتەوە، بۆیە ئەم بەڵایەی بۆ ناردووە، بەڵام بەپێی شەرع سزای ئەوانە کوشتنە... دەبێت هەر یەکەی سەد جەڵدەی لێ بدرێت... "

ئەو مێتۆدە شۆڕشگێڕانییەی (شێرزاد ناجی) بە کاری دەهێنێت، کە گرتنەبەری هەموو ڕێگایەکە بۆ بەدەستهێنانی ئامانج مێتۆدێکی یوتەلیتاریان (**Utilitarian**)یە، کە مانای سوودوەرگرتنە لە هەر ڕووداوێك بۆ بەرژەوەندیی گشتی. ئامانجی ئەو ڕێبازە دەستتەبەرکردنی خۆشبەختییە بۆ زۆرینە بەبێ ڕەچاوکردنی کەمینە. لە بۆچوونی یوتەلیتاریانیزم (**Utilitarianism**)دا زۆر ئاساییە لە پێناو ماناوەی زۆرینە، کەمینەیەك ببێتە قوربانی. بۆ نموونە ئەگەر لە ڕووداوێکدا بە کوشتنی دە کەس، پانزدە کەس ڕزگار ببن، ئەوا پێویستە دە کەسەکە بکوژرێن و پانزدە کەسەکە ڕزگاریان ببێت، ئەو کارەیش لەو بۆچوونەدا کارێکی تەواو دروستە. بۆ ئەوەی ڕاستیی ئەو بۆچوونەمان لەبارەی (شێرزاد ناجی)یەوە بسەلمێنین، بۆچوونی ئەو کارەکتەرە شۆڕشگێڕە بە نموونە دەهێنینەوە، کە گوزارشتە لەو کاتەی، کە (ئیمان) یان (ڤیان) و (عیماد) دەکوژرێن. ئەوەتا لە دیالۆگی(شێرزاد ناجی) و (ئازاد)دا، (شێرزاد ناجی) دەڵێت:

"ــ ڕاستە، بەڵام تۆ نابێت ئاوا ڕۆمانسییانە ڕووداوەکە بخوێنیتەوە... با سۆز بەرچاوت تاریك نەکات، هاوڕێی ئازیزم... ئەوان بە گوللەی کۆنەپەرستی خوێنیان ڕژا، بەڵام مەرگی ئەوان کاریگەرییەکی پۆزیتیڤانەی هەبوو... بەڵێ، مەرگی ئەوان هەزاران کەسی بە ئاگا هێنایەوە... شەمسەدینی لە مزگەوت دەرهێنا و کردیە پێشمەرگە... لەوانەیە ئەوان بە دەساڵی پێشمەرگایەتی نەیانتوانیایە بە قەدەر ئەم ماوە کورتە خزمەتی شۆڕش بکەن."

ڕستەی (مەرگی ئەوان هەزاران کەسی بە ئاگا هێنایەوە...) ئاماژەیە بە بۆچوونە یوتەلیتاریەکانی (شێرزاد ناجی)، کە زیاتر ئەنجامی شتەکانی بە لاوە گرنگە نەك مێتۆد یان ڕێگەی بەدەستهێنانی ئامانج. واتە گرنگ نییە دوو کەس، کە خۆشەویستی یەکترن کوژراون، بەڵکو ئەوە گرنگە ئەو ڕووداوە هەزاران کەسی بە ئاگا هێناوەتەوە. ئەو هەزاران کەسە لە دیدی ئەودا زۆر گرنگترە لەوەی، کە دوو کەس کوژراون. ئەوەیش مانای وایە لە شۆڕشدا بەهای تاك (**individual**) دەکەوێتە خزمەت بەهای زۆرینە (**majority**)وە. (جێرەمی بێنتەم- **Jeremy Bentham**) ، کە فەیلەسووفێکی ئینگلاندییە و لە ساڵی **1748** لە دایك بووە و لە ساڵی **1832** کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە پێشەنگی ئەو فەیلەسووفانەی، کە بە توندی بەرگریی لە بۆچوونی یوتەلیتاریانیزم دەکەن و پێیان وایە بۆ زانینی





ڕاست و هەڵە دەبێت بەرژەوەندیی زۆرینە لە بەرچاو بگیرێت. (بێنتەم) لە کتێبی (دەروازەیەك بۆ بنەماکانی ڕەوشت و یاسادانان- **An Introduction to the Principles of Morals and Legislation**) ئاماژە بە چەمکی (خۆشبەختیی گشتی – **General happiness**) دەکات وەك پێوەری زانینی ڕاست و هەڵەی خواستی هەر کردارێك، بۆیە پێی وایە هەر کردارێك، کە خواستی فەراهەمکردنی خۆشبەختی بێت بۆ زۆرینە یان گشت ئەوا ڕاستە و هەڵە نییە. ئەگەرچی لەو کتێبەدا (بێنتەم) ئاماژە بەوە دەدات، کە پێویستە بەرژەوەندیی تاك لە دانانی یاسا و دیاریکردنی ڕاست و هەڵە لە بەرچاو بگیرێت، بەڵام پێی وایە لە دواجاردا دەبێت هەموو شتەکان لە بەرژەوەندیی خۆشبەختیی گشتیدا بن، چونکە پێی وایە خۆشبەختیی کۆمەڵ خۆشبەختیی تاکیشە. بۆیە پێی وایە بنەمای خۆشبەختیی زۆرینە بنەمای ڕەوشتیش دیاری دەکات. لەم شێوازە بیرکردنەوەیە و لە زۆربەی دۆخەکاندا تاك هەست بە ماف و ڕۆڵی خودیی خۆی ناکات، بەڵکو خۆی وا دەبینێت، کە ئامرازێکە بۆ خۆشبەختیی زۆرینە. هەمان ئەو بۆچوونە لەو ڕۆمانەدا بەرجەستە کراوە. ئەوەتا پاش بۆچوونەکەی (شێرزاد ناجی) لەبارەی قازانجی کوژرانی (ئیمان) و (عیماد) بۆ شۆڕشەکەیان، لە ڕێگەی زمانی دووەمی گێڕەرەوە هەستی (ئازادی هەمین مامان)یش لەبارەیەوە دەزانین، وەك هاتووە:

" لە هەر کاتێکی دیکە زیاتر هەستت دەکرد، کە تۆیش تەنیا بۆ ئەوە هەیت، سبەینێ بە مەرگی خۆت خەڵکانێك بە ئاگا بێنیتەوە و بەرەو شاخیان ببەیت......"

لێرەدا (ئازاد) هەست بەوە دەکات، کە بەهای بوونی ئەو لە شۆڕشدا یەکسانە بەو سوودەی دەیبەخشێت لە پێناو هێنانەدیی ئامانجی ئەوانی دیکە و بەهای خۆی وەك تاکێك ون دەکات، چونکە ئەو بۆچوونە شۆڕشگێڕانەی بەسەر واقیعی ئەودا زاڵە جێگای باسکردن و ڕۆڵبینینی تاکێکی ئازادی تێدا نابێتەوە. لە لایەکی ترەوە تاك لەناو هەر ئایدۆلۆجیا و گرووپێکیشدا بێت ناتوانێت حەقیقەتی تاکبوونی خۆی بشارێتەوە. بۆ نموونە هەر (شێرزاد ناجی) لە ڕووی سۆزدارییەوە دڵی بە (دڵارام)ەوەیە، کە هاوسەری (ڕەمزی ئازادی) بووە، بەڵام بەهۆی هەرەسی شۆڕشی ئەیلوولەوە (ڕەمزی ئازادی) خۆی دەکوژێت. (شێرزاد ناجی) کە ئەوە دەزانێت، دەڵێت:

" چما من ژنی ئاوام هەبێت، نەك شۆڕشێك هەرەس بێنێت، بەڵکو سەرتاپای دنیا بەسەر یەکدا بڕمێت، بیر لە خۆکوشتن دەکەمەوە...؟!"

لێرەدا (شێرزاد ناجی) هەرچەند لە دواییدا دەبێتە شۆڕشگێڕ، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە بتوانێت حەقیقەتی تاکبوونی خۆی بشارێتەوە، چونکە تاك بوونێکی فرەڕەهەند و ئاڵۆزە و ناتوانرێت بە بۆچوونی باو و کۆمەڵ بخوێنرێتەوە.

ئەوەی ئاماژەمان پێ دا دیدی شۆڕشگێڕیی (شێرزاد ناجی)یيە وەکو فیگەری سەرەکیی شۆڕش لەو ڕۆمانەدا، کە ڕۆڵێکی گەورە و بەرچاوی هەبووە لە هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆجیای شۆڕشگێڕانەی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) لە شاردا. دیوێکی تری ئەو شۆڕشە تێکۆشانی چەکدارییە لە شاخدا، کە کۆمەڵێك کارەکتەری جیاواز ئەو ڕۆڵە دەگێڕن، لەوانە (ئامانج)، (ئاواز)، (پۆلا جەنگۆ)، (وریا باگوردان)، (سەرۆ مەنجەنیق) زۆرانی تر لە خۆ دەگرێت. لە مێژووی شۆڕشی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) خەباتی شاخ مێتۆدی سەرەکیی هێنانەدی ئامانجەکانی شۆڕش بوو، کە باڵی زۆرینەی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)ی پێك دەهێنا.

## کێن ئەوانەی شۆڕش دەکەن؟

ئەگەر سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی نوێ لە شاخدا ڕۆڵی گەورەی گێڕاوە و سێنتراڵی گشتیی تێکۆشان بووە، ئەوا هەوڵ و ڕێکخستنەکانی شاریش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر تێکۆشانی شاخدا هەبووە. لێرەدا پێوەندیی نێوان شاخ و شار دەبێتە پێوەندییەکی گەورەی مێژوویی، چونکە شار و شاخ هەمیشە جووڵێنەری یەکتر بوون. ئەو پێوەندییە ڕووبەڕووی کێشەی جیۆپۆلۆتیکس (geopolitics) و مێژوومان دەکاتەوە، کە ئەو کێشەیە خۆی لە کاریگەریی هەڵکەوتەی جیۆگرافیا و شێوەژیانی تاکەکان لەسەر ژیان و دنیابینیان دەبینێتەوە. بەڵام پرسیاری سەرەکیمان ئەوە دەبێت، کە کێن ئەوانەی شۆڕش دەکەن و ئەو کارەکتەرانەیش دەرئەنجامی چ جۆرە واقیعێکن؟ بۆ نزیکبوونەوە لە وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستیمان بەوەیە تاك (individual)بناسین، چونکە بەبێ ناسینی تاك، ناسینی کۆمەڵگە (society) کارێکی نەکردەیە، چونکە کۆمەڵگە پێکهاتەیەکە لە کۆبوونەوەی تاکەکان بەیەکەوە. سەرتاپێی دنیابینی و شێوەژیانی تاکەکان ئاڕاستەی ژیانی کۆمەڵگە دیاری دەکەن، ئەو ئاڕاستە جیاوازانەیش دووبارە کاریگەریی لەسەر تاك دروست دەکەنەوە. ڕەوتی مێژوو و کەلتووریش دەوری سەرەکیی لە ئاڕاستەکردنی





تاکەکاندا دەبینن وەك (کارڵ مارکس) ئاماژەی پێ دەدات، کە ئەوە هۆشیاریی مرۆڤەکان نییە بڕیار لەسەر بوونی تاکەکان دەدات، بەڵکو ئەوە بوونی کۆمەڵایەتییە، کە هۆشیاریی تاکەکان دیاری دەکات. لەو بۆچوونەی (مارکس)دا تاك لە بکەر یان سەبجێکتەوە دەبێت بە ئۆبجێکت، چونکە بوونی کۆمەڵایەتی ئاڕاستەی ژیانی تاك دیاری دەکات.

ئاماژەمان بە دیدی (شێرزاد ناجی) وەك فیوگەری سەرەکیی شۆڕش لە شار و بەرگریکار لە بەرژەوەندیی زۆریینە دا، بەڵام تێمای سەرەکیی ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) پێشاندانی دیوی ناوەوەی کارەکتەرەکانە بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتی تاك. ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی ئیشکردن لەسەر حەقیقەتی کۆمەڵ کارێکی ئاسان بێت بەو پێیەی حەقیقەتی کۆمەڵ لەسەر یەکێتیی بۆچوونەکانی زۆریینە دامەزراوە، ئەوا ئیشکردن لەسەر حەقیقەت یان ڕاستەقینەی تاك لە ڕۆماندا کارێکی تەحەداکەرانە (**Challenging**)یە.

لە ئەدەبی مۆدێرندا تاك دەبێتە تێما و ڕۆڵگێڕی سەرەکیی ئەمەیش بە تایبەت پاش ئەوەی ئەدەبی مۆدێرن لە ڕۆمانی (دۆن کیشۆت) بەدواوە دەستبەرداری ئەوە دەبێت تاك وەکو قارەمان (**hero**) پێشان بدات و حەقیقەتەکانی دیکەی بشارێتەوە، چونکە قارەمان مرۆڤێك نییە لەسەرووی هەموو حەقیقەتەکانەوە بێت و بە گژ هەموو ئەژدیهاکاندا بچێتەوە، بەڵکو مادام قارەمان تاکە ئەوا هەمیشە لە بەردەم هەموو ئەگەرێکی لاواز و گەورەدایە. بۆیە ئەدەبی مۆدێرن جێگای ئەوەی تێدا نابێتەوە قارەمان وەکو مرۆڤێکی چاکەخواز و تاکە بەرگریکار لە ڕاستی پێشان بدات و ئەوانی تریش وەکو خراپەکار، کە لە کۆتایی ڕووداوەکاندا بە دەستی کارەکتەری قارەمان هەمووان لە ناو دەچن و بە سزای خۆیان دەگەن، بەڵکو ئەدەبی مۆدێرن



تێکشکاندنی وێنەی قارەمان و پێشاندانی دیوە شارەواکانی تاکە. نەك تەنیا تێمای سەرەکیی ئەدەبی مۆدێرن بەو شێوەیە، بەڵکو شیکاری و خوێندنەوەی دەروونییش وێنای قارەمان هەڵدەوەشێننەوە. ئەگەر (هاملێت) لە ڕەخنەی باودا کارەکتەرێکە دەیەوێت تۆڵەی باوکی بکاتەوە و پاشای مامی بکوژێت، کە دایکی مارە کردووەتەوە، بەڵام ناتوانێت و دواجار خۆیشی دەبێتە قوربانی، ئەوا لە دیدی (سیگمۆند فرۆید) (هاملێت) لەبەر ئەوەی خۆنەویستانە مەرامی کوشتنی باوکی هەبووە بەهۆی بوونی گرێی سێکسی بەرانبەر بە دایکی، ئەوا هەست بە تاوان دەکات و هەر ئەو هەستکردنەیشە ناتوانێت مامی بکوژێت.

مادام فەزای ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) فەزایەکی شۆڕشگێڕانەیە، ئەوا زۆرترین چاوەڕوانیمان بۆ دەرکەوتنی پاڵەوان یان قارەمانە گەورەکانە، چونکە لە هۆشیاریی گشتی (**common consciousness**)ماندا، شۆڕش بەرهەمی توانست و هەوڵی گەورەی قارەمانەکانە. وا دەردەکەوێت مۆتیڤ یان جوڵێنەری شۆڕش ئەو کەسانە بن، کە خاوەنی کاریزمای شۆڕشگێڕانەن. چەکدارەکان لە شۆڕشدا هەمیشە وەکو کەسانی بوێر و چاونەترس دەبیندرێن، کە ئەو بینینە هەم وێنەیەکی ڕۆمانسیانەیە بۆ شۆڕشگێڕ یان چەکدار، هەم وا دەکات شۆڕشگێڕ وێنەیەکی تەواوی پێ ببەخشرێت، کە جیای دەکاتەوە لەوانی دیکە. بەڵام لە ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) ئەو وێنەیە بۆ شۆڕشگێڕ ڕووبەڕووی تێکشکانێکی گەورە دەبێتەوە. ئەوەی شۆڕشگێڕە مانای وا نییە نەترسێت و لەوانی دیکە گەورەتر بێت، بگرە لە زۆر حاڵەتدا کەسی شۆڕشگێر و چەکدار خاوەنی لاوازی و ترسی گەورەیە و پەنابردنیشیان بۆ بوون بە شۆڕشگێڕ بۆ شاردنەوە یان زاڵبوونیانە بەسەر ئەو ترس و لاوازییانەدا.

(ئامانج) و (ئازاد) دوو نموونەی زۆر بەرچاوی تێکشکێنەری وێنەی شۆڕشگێڕن. دەتوانین (ئامانج) بە سەرەکیترین کارەکتەری ئەو ڕۆمانە دابنێین، چونکە گێڕەرەوەی دوو کەناڵی ڕۆمانەکەیە، لە کاتێکدا ڕۆمانەکە خۆی چوار کەناڵە. جیاوازیی شۆڕشگێڕانەی نێوان (ئازاد) و (ئامانج) ئەوەیە، کە (ئازاد) تەنیا لە ڕێکخستنەکانی شاردا ڕۆڵی دەبێت، بەڵام (ئامانج) لەدوایدا دەچێتە شاخ و چەك هەڵدەگرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا کۆمەڵێك خاڵی زۆر هاوبەشی کەسییەتیان لەنێواندا هەیە، بۆ نموونە هەردووکیان شەرمن و ترسنۆکن و لە ڕیسك و سەرکەشی دەترسن، بگرە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان ئاسوودە بژین و خۆیان لە سەرکەشی دوور بگرن. لە کاتێکدا هاوڕێکانی تریان وەکو (شێرزاد ناجی)، (شۆڕش) و (داندی) و ئەوانی تریش چاونەترس و بوێر دەردەکەون و بەردەوام سەرکەشی دەکەن،





بەڵام ئەوە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، کە (ئازاد) و (ئامانج)یش وەکو کارەکتەری شۆڕشگێڕی کاریگەر دەردەکەون و ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە بەبێ ئەوەی خۆیان ئاگایان لێ بێت.
(ئازاد هەمین مامان) کوڕی ژنێکی مامانە و هاوڕێیەکی نزیکی (شێرزاد ناجی)یە، هەر لەبەر ئەو هۆیەیە دەبێتە بەشێك لە فیگەری شۆڕشگێڕانە لە شاردا، کە بەهۆی (شێرزاد ناجی) یەوە دەستی لە زۆر کاروباری شۆڕشگێڕانەی شاردا دەبێت. بەڵام ترسێکی گەورەی لەو حەقیقەتەیە. وەك لە ڕۆمانەکەدا هاتووە:
" لە ترسان زمانت گۆی نەدەکرد... بێ ئەوەی ئاگات لێ بێت، کرابوویە ئەندامی ڕێکخستنی ناو شار... هەر بە سەرلەقاندن وەڵامیت دایەوە، کە قسەکانی بەجێن و ماڵەکەیانت جێ هێشت... دەتویست بە زووترین کات بگەیتەوە و بە دایکت بڵێی خێرا شێدەیەکت بۆ بکات، هەتا بیخۆیتەوە و بچیتە ژێر لێفەوە... دایکت باوەڕی وا بوو شێدە بۆ ڕەواندنەوەی ترس لە هەموو دەرمانێك چاکترە... "
شۆڕشگێڕبوونی (ئازاد) لەژێر کاریگەریی ئەوانی تردا بووە نەك ئەوەی خۆی بڕیارێکی سەربەخۆی دابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەورێکی گرنگی هەیە. ئەوەی مەبەستمانە بڵێین ئەوەیە، کە مەرج نییە هەموو ئەوانەی لە شۆڕشدان بە تەنیا باوەڕ و هۆکاری شۆڕشگێڕبوون کۆیان بکاتەوە و لەدوایشدا ببن بە قارەمان، بەڵکو زۆرجار شۆڕشگێڕبوون دەرئەنجامی کۆمەڵێك دۆخی نەخوازراوە. ئەوەتا (ئازاد) هەر کە هەست بەوە دەکات بووە بە ئەندامی ڕێکخستنی ناوشار، ترسێکی هەرە گەورە دایدەگرێت و لەو حەقیقەتەیش دەترسێت و بگرە دۆخی دەروونی دەگاتە ئەو ئاستەی، کە (شێدە) بۆ زاڵبوون بەسەر ترسەکەیدا بخواتەوە، کە باوکیشی لەو کاتەی دەترسا (شێدە)ی دەخواردەوە. بەڵام (ئازاد) خۆیشی ئەوە بە لاوازییەکی گەورە دەبینێت. وەك لە هەمان دۆخدا هاتووە:
" باوکت لە بەر دیدەتدا ون نەدەبوو... تفێکی گەورەت کردە ناو چاویەوە... ئینجا بەزەییت پێیدا هاتەوە و دوایی خۆزگەت پێی برد، کە لەم دنیایە ڕزگاری بووە... خۆزگەت بە سەردەمەکەیشی برد، کە مرۆڤ دەیتوانی بێ ترس بترسێت، کەچی ئەوەتا لەناو ئەو هەموو جەربەزانە، مەحکوومی بەوەی ئازایەتی بنوێنیت، لە کاتێکدا دڵت پڕیەتی لە ترس... لە یەکێك لە گفتوگۆکاندا، هەر هێندە پێیت گوت:

- وا نەزانی من ترسنۆکم، شێرزاد."

(ئازاد) ترس بە لاوازییەکی گەورەی دەروونی دەزانێت و حەزیش بەوە ناکات، کە ترسنۆکە لە کاتێکدا دەورووبەری وا دەردەکەون مرۆڤی ئازا و جەربەزە بن. زەمەن و زەمینەی (ئازاد) بەهۆی شۆڕشەوە وا ڕێك کەوتووە، کە ترسان تێیدا لاوازییەکی گەورە بێت، چونکە ترس دژی شۆڕش و گۆڕینی واقیعە، بۆیە خۆزگە بەو زەمەنە دەخوازێت، کە تێیدا باوکی بێ ترس ترساوە. (ئازاد) هەرچەندە بە لاوازییەکی گەورەی دەزانێت، کە بەشێك نەبێت لە شۆڕش و بگرە هیوای بە خۆیەتی، کە بەشێکە لێی، بەڵام ترسەکەی گەورەترین بەربەستە. (جێرمی بێنتەم) پێی وایە هیوا دەرئەنجامی ویستی خۆشبەختییە، کە دەشێت کۆمەڵێك پاڵنەر هۆکاری هیوا بن، بۆ نموونە شانازیکردن بە خۆ و ئەو بنەما فەلسەفی یان ئایینانەی، کە ئەوای تر پەسەندی دەکەن و بە گرنگی دادەنێن. لە هەمانکاتدا ترس لە ئایندە و سزاکانی هۆکاری گەورەن بۆ ئەوەی تاکەکان لە کردنی هەر کارێك ترسیان هەبێت. (بێنتەم) دەگاتە ئەوەی پێی وابێت، کە ترس بەهێزترە لە هیوا. بۆیە کاتێ دەبینین (ئازاد) گازاندە لە ترسەکەی خۆی دەکات و دەیەوێت وا پێشانی ئەوانی تر بدات، کە ناترسێت، ئەوا مانای ئەوەیە دەزانێت ئەو ترسە لە هیواکەی گەورەترە.

ئەگەرچی (ئازاد) نموونەیەکی بەرچاوی شۆڕشگێڕێکی ناڕاستەوخۆی ترسنۆکە، بەڵام هێشتا هێندەی (ئامانج) دەوری نییە لە پێشاندانی کارەکتەری شۆڕشگێڕی ترسنۆك، چونکە ئەگەر (ئازاد) بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێت تێکەڵ بە شۆڕش دەبێت، ئەوا (ئامانج) نەك تێکەڵ بە شۆڕش دەبێت، بگرە دەچێت بۆ شاخ و دەبێت بە یەکێك لە پێشمەرگەکان.

ئەگەر (ئازاد) بەهۆی (شێرزاد ناجی)یەوە دەبێتە شۆڕشگێڕ سەرەڕای ئەو هەموو ترسەی لە ناخیدا هەڵدەقوڵێن ئەو هەموو ناخۆشییەی بە سەری دێن، ئەوا سەربردەی (ئامانج) زۆر جیاوازترە، چونکە باوکی، کە ناوی (ماجید هەمزە قەڵاتێ)یە، یەکێکە لە ئەفسەرە باڵاکانی ڕژێمی بەعس، بەڵام بەهۆی ئەوەی لە (بەغدا) ژن دەهێنێت، لە دایکی (ئامانج) جیا دەبێتەوە. پێوەندیی (ئامانج) بە شۆڕشەوە لەژێر کاریگەریی هاتنی ماڵی (شۆڕش)دایە بۆ ماڵەکەیان، کە پاش ئەوەی شۆڕشی ئەیلوول شکست دەهێنێت، باوکی (شۆڕش)، کە ناوی (ڕەمزی ئازادی)یە خۆی دەکوژێت و بەو هۆیەشەوە ژنەکەی، کە ناوی (دڵارام) ە، کچەکەی، کە ناوی (هەتاو)ە لەگەڵ (شۆڕش) لەدوای خۆیدا جێ دەهێڵێت. ئەوانیش پاش هاتنەوەیان لە شاخ ڕوو دەکەنە ماڵی (ئامانج) و پەنایان دەدەن. بە ئاسانی



کاریگەریی شۆڕش لەسەر هۆشیاریی (شۆڕش)، (هەتاو) و (دلآرام)دا دەبینرێت. (شۆڕش)، کە هاوتەمەنی (ئامانج)ە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ژیانی (ئامانج)دا دەبێت، چونکە ئەو ترس و شەرمەی لە (ئامانج)دا هەیە هیچ کات لەودا نابینرێت، بەڵکو پاش هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێیش هەمیشە سەرقاڵی سەرکێشییەکانییەتی. کاتێ (شۆڕش) لە هەندێك دۆخدا دوور لە (ئامانج) سەرقاڵی سەرکێشییەکانیەتی، ئەوا (ئامانج) هەست بە لاوازی و پەراوێزخستن دەکات، بەڵام کاتێکیش (شۆرش) و هاوڕێکانی وەکو (داندی)، (جاوید)، (ماهیڤان) و (هەژار) دەیانەوێت (ئامانج)یش هاوبەشیان بێت، ئەوا دووباره (ئامانج) هەست بە ترسێکی گەوره دەکات و لە کردنی هەر ڕیسك و سەرکێشییەك دەترسێت. هەر وەك لەم نموونەیەدا هاتووە:

" سەرنجت دابوو هەتا دەهات (شۆڕش) و (داندی) زیاتر نهێنییەکانیان لێ دەشاردیتەوە و باوەڕیان بە توانا و لێهاتوویت نەدەما... بەردەوامیش سەرزەنشتی خۆتت دەکرد، بەوەی ناتوانیت بڕیارێکی ڕاست و دروست لەبارەی ژیان و ئاییندەتەوە بدەیت... ئاخۆ تۆ دەتەوێت چۆن بیت...؟! چیت دەوێت و بە چ لایەك قایلیت...؟! ئەگەر داوات لێ بکەن لە سەرکێشییەکانیاندا بەشدار ببیت، دەترسیت و زەندقت دەڕژێت... کاتێکیش بە لاوەت دەنێن، لە ناخەوە گڕ دەگریت و هاوارت لێ هەڵدەستێت... هەر ئەو حاڵەتی نەخۆشی و کەوتن و دڵتێکهەڵاتنەی زوو زوو دەتخات، خۆی لە خۆیدا مایەی نیگەرانی و شەرمەزارییە... "

خاڵێکی تر لەبارەی (ئامانج)ەوە ئەوەیە، کە بەهۆی ئەوەی باوکی یەکێکە لە ئەفسەرە باڵاکانی حیزبی بەعس ئەگەرچی لەگەڵیشیدا ناژیێت، ئەوا لە زۆربەی دۆخەکاندا هەست بە لاوازییەکی گەوره دەکات بەو پێیەی باکگراوندی سیاسیی بنەماڵەکەی دژی هەستی ناسیۆنالیزمی کوردییە ئەگەرچی مامی (ئامانج)، کە ناوی (فەرەیدوون)ە یەکێکە لەوانەی ڕۆڵێکی بەرچاوی لە چالاکی سیاسیی کوردییدا هەیە. (ئامانج) نەك تەنیا لە (ئازاد) جیاوازە، بەڵکو لەڕووی ڕۆڵی شۆڕشگێڕییەوە لە (شێرزاد ناجی)یش جیاوازە، چونکە وەکو ئاماژەمان بۆ کرد بەشداری لە شۆڕشی چەکداریی شاخیشدا دەکات، بۆیە پێشاندانی ڕەهەندە سایکۆلۆجی،



کەلتووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کارەکتەرە لە بەشێکی زۆری تێمای سەرەکیی ئەو ڕۆمانە نزیکمان دەکاتەوە. (ئامانج) کارەکتەرێکی ترسنۆك و شەرمنە. ترسەکە خۆی لە ئاستی شڵەژاوییەکی لە ڕادەبەدەر (anxiety disorder) دا دەبینێتەوە و بەردەوامیش هەست بە ناسکی و پاسیڤبوونی خۆی دەکات. (ئامانج) بەردەوام فۆبیا (Phobia)ی هەیە، کە بە تەنیا ترسێك نییە لەو شتانەی، کە بوونیان هەیە، بەڵکو لە زۆربەی دۆخەکاندا ترسە لەو شتانەی، کە بوونیان نییە یان پێویستی بە ترس نییە. بۆ نموونە لە یەکێك لە دۆخەکاندا کاتێك لە دەرگای ماڵیان دەدرێت ترسێکی گەورە دایدەگرێت و چاوەڕێی کارەساتێکە، کەچی دەردەکەوێت، کە دوو کوڕن بەدوای ڕاوی کۆترەوەن، بەڵام دۆخی (ئامانج) زۆر تێك دەچێت. وەك لە ڕۆمانەکەدا هاتووە:

" هەستت دەکرد بەرگەی یەك تەقەی دیکەی ئەو دەرگایە ناگریت... خۆزگەت دەخواست ئەوان دەهاتن و بە ئەسپایی وەکو کۆترێکی باڵکراو دەیانگرتی، بەڵام نە سووك و نە قایم لەو دەرگایەیان دەدا... بۆت دەرکەوت ئەو نیگەرانییەی مرۆڤ لە کاتی چاوەڕێکردنی کارەساتەکاندا بە خۆیەوە دەبینێت، هیی ئەوە نییە، کە لە گەیشتنیان دەترسێت وەکو لێی تێگەیشتووین، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کارەساتەکە زوو ناگات، بە ڕادەیەك دەیەوێت بە پێی خۆی بەرەو سەرچاوەی کارەساتەکە بچێت و کۆتایی بەو هەموو پەشێوی و دڵەڕاوکێیە بهێنێت... "

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت دۆخی سەرلێشێواوی و پەشکۆکاو (anxiety)ی (ئامانج) لە ئاستێکی زۆر بەرزدایە، چونکە هەمیشە چاوەڕوانی کارەساتە، کە ئەو چاوەڕوانییە ئاماژەیە بەو سەرلێشێواوییەی. لە دیدی (سیگمۆند فرۆید) سەرچاوەی هەرە سەرەکیی پەشۆکاوی و توڕەیی ترسە. لە دیدی ئەودا ترسی ڕاستەقینە ترسێکی لۆگیکییە بەو پێیەی پێوەندیی بە مەترسیی دەرەکی (External danger) یەوە هەیە، چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ترسە بەندە بە توانا و دیدی ئێمە بۆ جیهانی دەرەکی، بەڵام گەشەکردنی ترس هیچ کاتێك بە مەبەستەوە نییە، واتە کەس نایەوێت ئەو ترسەی هەیەتی زیاتر بێت. (فرۆید) پێی وایە ماوەی چاوەڕوانکراوی ترس (fear expectancy) لەزۆربەی دۆخەکاندا سوودبەخشە، چونکە وا دەکات خود مێکانیزمی بەرگری (defense mechanism) بگرێتە بەر، لە لایەکی ترەوە بوار بە دەرکەوتنی ئەو شتە دەدات، کە لێی دەترسین، چونکە دواجار ئێمە لە دۆخ و دەرئەنجامی هەر ڕووداوێك پێویستە هەست بە بەرپرسیاریەتی بکەین. لەگەڵ ئەوەیشدا سەرچاوەی



یەکەم ترس دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی جیابوونەوە لە دایك (separation from the mother)، لەو دۆخەیشدا مرۆڤ هەمیشە هەست بە ترس دەکات، چونکە جیابوونەوە لە دایك بۆشایی لای خود دروست دەکات و دەبێتە هۆکار بۆ ئەوەی منداڵ تا دەژیێت باجی ئەو جیابوونەوەیە بدات. لەگەڵ ئەوەیشدا لەو کاتەوەی، کە منداڵ جیا دەبێتەوە هەمیشە بە ترسەوە مامەڵە لەگەڵ هەر ڕووداوێکدا دەکات، کە پێوەندیی بە دایکیەوە هەبێت. ئەو بۆچوونەی (فرۆید) بە ئاسانی بەسەر (ئامانج)دا بەرجەستە دەبێت، چونکە ئەم هەمیشە بە شێوەیەکی ناخودئاگا یان خۆنەویستانە بیر لە دایکی دەکاتەوە، بەڵام بێدەستەڵاتیی ئەو لە ئاست ئەو شتانەی بەرانبەر بە دایکی دەکرێن وای کردووە ببێتە کارەکتەرێکی پەشۆکاو، ئەگەرچی دایکی لە دۆخێکی باشدایە، بەڵام لە خەیاڵی ئەودا هەمیشە ڕووبەڕووی دەستدرێژی و بەکارهێنان دەبێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم پەڕەگرافە، زیاتر ئەو دیوەی (ئامانج)مان بۆ دەردەکەوێت:

" شەوانی منداڵی کاتێك بە تەنیا لەسەر تەختی نووستنەکەت پاڵ دەکەوتیت، خەیاڵی ترسناکت دەکرد... کەسانی سەیر سەیر، کە شێوەی خورافییان هەبوو، خۆیان و گیانەوەرە زەبەلاحەکانیان لە شوێنێکی وەکو ئەم حەمامەوە دەهاتن، چەندین گۆڕستان و کەلاوەیان دەبڕی و دەگەیشتنە ناو باخ، حەوشە و ژوورەکانتان... هەستت دەکرد کۆمەڵێك لەو پیاوە دەمامکدراوانە وا لەمدیو لەسەر دایکت پاڵ کەوتوون... هێندە بە قایم تەکانی پێ دەدەن، کە نەك هەر تەختی نووستنەکەی دەکەوێتە جیرەجیر، بەڵکو لامپای سەر مێزە بچووکەکانی ئەم تەنیشت و ئەو تەنیشتی و چینی و گڵاس و کووپ و پیاڵە گرانبەهاکانی ناو بۆفیەکەیش دەلەرنەوە و سەما دەکەن..."

ئەو دۆخەی (ئامانج) دۆخێکی وەهمییە و سەرچاوەکەی لەو پرۆسێسە ئۆنتۆلۆجییەوە هاتووە، کە بووەتە هۆکاری یەکەم جیابوونەوەی منداڵ لە دایك، چونکە لە دیدی (فرۆید)ەوە لەدایکبوون سەرچاوەی گرێی ئازاربەخشی هەستەکانە (complex of painful feelings)، کەواتە گرنگیدان بە دایك و هەمیشە ترس لەوەی شتێکی بە سەر بێت، تا ئەو دۆخەی (ئامانج)، کە ڕووبەڕووی وەهمی جۆراوجۆر دەبێتەوە پێوەندیی بە ترسێکی خۆنەویستانەوە هەیە بۆ دایك. ئەو ترسەی ئەوە بە تەنیا ترسێك نییە لەو پیاوانەی، کە نەناسراون،



بەڵکو (ئامانج) هەمان وەهمی بەرانبەر بە باوکی خۆیشی هەیە و وەك یەکێك لە پیاوە دەمامکدارەکان دەیبینێت.
وەك لەدوای ئەو پەرەگرافەوە هاتووە:

" ئەو ترسە لەو کاتانەیشدا یاخەی بەر نەدەدایت، کە باوکت بە مۆڵەت دەهاتەوە، بگرە ئەویشت وەکو یەکێك لە پیاوە دەمامکدراوەکان دەبینی، ئەو پیاوە زەبەلاحانەی خۆیان هەڵدەدایە سەر تەختی نووستنەکە و تەکانیان بە دایە دەدا... هەر کە دەتزانی باوکت هاتووەتەوە، هەموو سەگ، ورچ، مەیموون و پڵنگە پەڕۆیینەکانت لەژێر تەختی نووستنەکە دەشاردەوە، بۆ ئەوەی سبەینێ ئەوان بۆت بگێڕنەوە، کە ئاخۆ ئەوە هەر بە ڕاستی باوکتە، یان یەکێکە لە پیاوە دەمامکدراوەکان... لەودیو گوێت هەڵدەخست، بەڵام تەنیا جیرەجیرِی تەختی نووستنەکە و ئاخوئۆفی تێکەڵ لە پێکەنین و تریقانەوەی ئەوانت دەبیست... بەیانی کاتێ گیانەوەری ژێر تەختەکەت دەهێنایەوە ژوورەکەت، سەگ، ورچ و پڵنگەکە، بێدەنگ بێدەنگ لە چاوتیان دەڕوانی... وەك بڵێی تاوانێکیان کردبێت، دەمیان دادەخست و وەڵامی یەك پرسیاریان نەدەدایەوە، لە کاتێکدا مەیموونەکە سەری دادەخست و کوڵمەکانی سوور هەڵدەگەڕان، هەر دەتگوت لە ڕووی نایەت قسەت بۆ بکات... بۆنێکی سەیریشیان لێ دەهات، کە نەدەکرا بڵێی خۆشە، یان ناخۆش، بەڵام قێزت لێیان دەهاتەوە... "

لەو نموونەیەدا تەواو هەست بەوە دەکەین، کە (ئامانج) بە سەختی بە دەست (گرێی ئۆدیپ- **Oedipus Complex**)ەوە دەناڵێنێت، کە لای (فرۆید) ئەو گرێیە پێوەندیی بە حەزی سێکسیی منداڵەوە هەیە بۆ دایکی. دەرکەوتنی گرێی ئۆدیپ لە قۆناغی (ئەناڵ ستەیگ ( **Anal Stage**- واتە لە تەمەنی یەکساڵییەوە تاکو سێساڵی)یە ، کە کاتێك منداڵ شیری دایکی دەمژێت، پێڕەوی لە کردەیەکی سێکسی دەکات. بۆیە دەمی منداڵ دەبێتە ناوچەیەکی چێژدار، تەنانەت پاش تەواوبوونی ماوەی مژینی مەمکی دایك، منداڵ پەنجەی دۆشاومژەی خۆی دەخاتە ناو دەمیەوە، لە قۆناغەکانی دیکەیشدا ماچ دەبێتە کردارێکی چێژبەخش. بۆیە پێوەندیی منداڵ بە دایکەوە دەبێتە پێوەندییەکی سێکسی. لەو قۆناغەدا منداڵ کەسێکی خۆپەرستە و دەیەوێت غەریزەکانی خۆی پڕ بکاتەوە. ئەو پێوەندییە منداڵی کوڕ و کچ بە یەکەوە دەگرێتەوە، هەرچی کچە لە پێوەندییەکی هاوتوخمبازی دایە لەگەڵ دایکدا. لەگەڵ دەرکەوتنی باوك پێوەندیی دوولایەنی دەگۆڕێت بۆ پێوەندیی سێلایەنی،





بە تایبەتی لای کچ هەستێکی دیکەی بەرانبەر بە باوك سەر هەڵدەدات. لە تەمەنی فالیك ستەیگ (Phallic stage) واتە لە چوارساڵی تاکو پێنجساڵی یان شەشساڵییەوە، لای کوڕ (گرێی ئۆدیپ- Oedipus complex ) و لای کچیش (گرێی ئیلکترا- Electra complex ) سەر هەڵدەدەن. حەزی کوڕ بۆ دایك و غەریزەی کچ بۆ باوك لای (فرۆید) پرۆسێسێکی گشتگیرە و پێکهاتە ئاڵۆزەکانی نەست (unconsciousness) ئەو کارە ڕادەپەڕێنن، بەڵام لەگەڵ بینینی هەڵسوکەوتەکانی باوك بەرانبەریان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەرکەوتەکانی ئەو دوو گرێیە دیار نامێنن و لە نەستدا جێگیر دەبن، کە کانگای حەزە سێکسییە سەرکوتکراوەکانە. لێرەدا منداڵ دەکەوێتە جەنگی لەناوبردنی حەزە نامەحرەمەکانی بەرانبەر بە دایکوباوکی. کوڕ هەوڵی خۆ گونجاندن لەگەڵ واقیعدا دەدات و دەیەوێت جێگای باوکی بگرێتەوە، بەمەیش خەونی بوون بە باوك دەبێتە پرۆژەی ئایندەی. هەرچی کچە دیار نییە، کە چۆن بەرانبەر بە غەریزەکەی دەوەستێتەوە، چونکە بە پرۆسێسی خەساندن (the process of castration) تێپەڕیوە، بەڵام ئەوەی دیارە کوڕ و کچ بەسەر گرێکانیاندا زاڵ دەبن، بەمەیش گرێکانیان لە کرداری هەستیارییدا دەچێتە خانەی نەستەوە.

کەواتە ئەو ترسەی (ئامانج) پێوەندیی بە یەکەم جیابوونەوەی ئەوەوە هەیە لە دایکی، کە ئەو جیابوونەوەیە بریتییە لە ساتی لەدایکبوون، بەمەیش یەکەم دەستپێکردنی ژیان هاوکاتە لەگەڵ یەکەم لەدەستدان، کە لەدەستدانی دایکە. لێرەدا منداڵ خۆی بە خاوەنی دایك دەزانێت، بەڵام بە هۆی ئەوەی دەستەڵاتی نییە، ئەوا تەنیا دەتوانێت لەگەڵ پەشێوییەکی خۆنەویستانەدا بژییێت. (ئامانج) بەردەوام بەدوای پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە قووڵە سایکۆلۆجییەوەیە. بەدوای هاوشێوەکانی دایکیەتی، کە مەبەستمان ڕەگەزی بەرانبەرە، بۆیە بەردەوام ئارەزووی سێکسی بۆ ئەو مێینانە هەیە، کە لە دەوروبەری ئەوەوەن بەبێ ئەوەی بتوانێت پێوەر بۆ جیاوازیی تەمەن دابنێت. بۆ نموونە خۆنەویستانە ئارەزووی بۆ (دلارام)ی دەستەخوشکی دایکی، کە هاوکات دەکاتە دایکی (شۆڕش) هەیە، ئەگەرچی تەمەنی نزیکە لە تەمەنی دایکیەوە. بە هەمان شێوە ئارەزوویەکی بێوێنەی بۆ (هەتاو)ی خوشکی (شۆڕش) هەیە، کە دەستگیرانی (فەرەیدوون)ی مامیەتی. وەك لەم پەرەگرافەدا هاتووە:

" نا، تۆ ماوەیەکی زۆر نەتویست وەڵامی پرسیارەکانی (هەتاو) بدەیتەوە... بەشی ئەوەندەیش ئاگات لەخۆ بوو، کە نەهێڵی زەفەرت پێ ببات... ئەو تێکشکانەت بە هەل بزانێت و بە پرسیار داتگرێتەوە... ئەنجام وات لێ بکات ددان بە هەموو شتەکاندا بنێیت و تێکڕای نهێنییەکان بدرکێنیت... دوای ئەوەی بۆ خانووەکەی (شێخ موعتەسەم) گۆێزابووتانەوە، ئیتر نەتاندەتوانی لە ژوورەوە دوو بە دوو دابنیشن و گفتوگۆ بکەن، بۆیە شەوان بانگی سەر جێگاکەی خۆیی دەکردی و لە تەنیشتیەوە پاڵ دەکەوتی... ئەوەندەی لە باوەشیدا چێژت دەبینی، دوو هێندەیش ئازارت دەچەشت، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە زمانی خۆیەوە زانیت، کە (مامە فەرەیدوون)تی خۆش دەوێت و دەبێتە هاوسەری ئایندەی ئەو... بە مانایەکی دیکە دەبێتە ئامۆژنت... ئەمەی ئەو جارە پێ گوتی، کاتێ هەستی کرد تۆ بە شەرمەوە لە تەنیشتی ڕادەکشێیت و بە پارێزەوە قسەی بۆ دەکەیت... بەڵام نە چێژی باوەشی کەم بووەوە و نە ئازارەکەیشی، بگرە هەردووکیان زیاتر بوون... "

لێرەدا (ئامانج) هەم هەست بە گوناه دەکات، هەم چێژ لەو هەستە دەبینێت، کە لە تەنیشت دەستگیرانی مامەکەی ڕاکشاوە و قسەی لەگەڵدا دەکات. پێوەندییەکی شاراوە لەنێوان هەستکردنی (ئۆدیپ) بە گوناهەکەی خۆی لە ئاست کوشتنی باوکی و هاوسەرگیریکردن لەگەڵ دایکیدا هەیە لەگەڵ ئەو هەستکردنەی (ئامانج) بە گوناه بەرانبەر بەو هەستە سێکسوالییەی بۆ (هەتاو) هەیەتی. لە هەردوو دۆخەکەدا ئارەزووی سێکسی بەرانبەر محرم (forbidden) بوونی هەیە. لێرەدا (کاروان کاکەسوور) وەکو (فرۆید) سەرچاوەی هەموو ئارەزووە سێکسییەکان بە تەنیا بۆ دایك ناگەڕێنێتەوە، بەڵکو ئارەزووی سێکسی لای ئەو ئارەزوویەکی پەتییە. هەرچەند (ئامانج) دەیەوێت بەسەر ئەو ئارەزووەدا زاڵ بێت و خۆی لە هەستی گوناه بە دوور بگرێت، بەڵام ناتوانێت. (جاك لاکان) پێی وایە ئێمە ناتوانین بەسەر ئەو ئارەزووەدا زاڵ بین مادام ئەو ئارەزووە دابەشبوونی بایەلۆجی فالوس یان ئەندامی نێرینە (Biological separation of phallus)ی بەدوای خۆیدا هێناوە. بۆیە کردەی سێکسی لای (لاکان) کردەیەکی خۆپەرستانە یان نارسیستیك (narcissistic)ە. تەنانەت ئەو کردەیە خۆشەویستی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بۆیە خۆشەویستی کردەیەکی نارسیستیکە و بە هۆیەوە ئیگۆی خود بەسەر ئەوی دیکەدا لە ڕاستیی (real)ەوە بۆ قۆناغی خەیاڵی (imaginary) دەڕوات. لێرەدا بۆ خود جیاوازی لەنێوان محرەم و نامحرەمدا نییە مادام



هەردووکیان ئەوی دیکەن (**the other**). لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەوەی وا دەکات خود ئەو ئارەزووە نامەحرەمە کەبت (**Repression**) بکات، لای (لاکان) زاڵبوونی دەستەڵاتی کەلتوورە بەسەر سرووشتدا. لە هەموو دۆخەکاندا، دەستەڵاتی سیستەمی زمان خۆی زاڵ دەکات و خود دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە لای (لاکان) لە نەستی ئێمەدا (ئەوی تر) هەمیشە دیسکۆرس (**discourse**) دەخوڵقێنێت، بۆیە لەوە بەدواوە ئارەزووەکان هیچ کات بە ڕاستەقینەیی گوزارشت نین لە ئارەزووی ئێمە مادام کەوتونەتە ژێر سیستەمی ئایدۆلۆجیی کەلتوور، چونکە سیستەمی کەلتوور و زمان دەستەڵاتی فەنتازیامان لێ دەستێننەوە، کە ئارەزوو (**desire**)ە پەنهاکانی ئێمەی لە خۆ گرتووە. لەژێر هەمان تیۆردایە، کە (سلاڤۆی ژیژەك) دەگاتە ئەوەی بڵێت "لە فەنتازیادا، فێر دەبین چۆن ئارەزوو بکەین." ئەوەی وا دەکات (ئامانج)ی کارەکتەر لەگەڵ ئەو ئارەزووە پەنهانانەی خۆیەوە بژیێت، فەنتازیایەتی. (ئامانج) تەواو لەژێر ڕکێفی فەنتازیای خۆیەتی تا ئاستێك، کە زۆر جار دۆخی واقیعیی خۆی لە بیر دەکات، هەر لەبەر ئەوەیشە ترس و شەرمی هەیە، چونکە فەنتازیای ئەو پاڕادۆکس لەگەڵ واقیعی ژیانی دروست دەکات. ئەم ئەگەرچی لە فەنتازیادا ئازادانە ئارەزوو دەکات، بەڵام هەمیشە ترسێکی گەورەی لەوە هەیە ئەو فەنتازیایە ببێتە واقیع. لەهەمان کاتدا، ئەو ئارەزووە فەنتازییایانەی لە شێوەی وڕێنە خۆیان دەردەخەن. بۆ نموونە ئەو کاتەی نەخۆشە لە شێوەی وڕێنە ئەو ئارەزووە پەنهانەی خۆی بۆ (دلارام)ی دەستەخوشکی دایکی دەردەخات. وەك لە ڕۆمانەکەدا هاتووە:

" ماڵەکە کشومات بوو... دوایی (دادە دلارام) بە ئەسپایی دەرگای کردەوە... کاتێك زانی هەستاویت، هاتە لاتەوە:

– ئامانج گیان، باشتر بووی، قوربانت بم...؟!

لەسەر لایەکی تەختی نووستنەکەت دانیشت... دەستی بە قژ و دەموچاوتدا دەهێنا و ماچی دەکردیت... پێش ئەوەی پرسیاری دایکت و ئەوان بکەیت، خۆی گوتی:

– هەر من لە ماڵم... ئێستا نانی بەیانیت بۆ ئامادە دەکەم... بەڵام با جارێ کووپێك شیری گەرمت بۆ بێنم.



ویستی هەستێت، تۆ دەستیت گرت:

- هیچم بۆ ناخورێ.

- ئاخر نابێت بە قوربانت بم... دەبێ شتێك هەر بخۆیت... ئێوارەیش لەگەڵ دایکت دەتبەینە دۆکتۆر.

- ناتوانم هیچ شتێك بخۆم.

- لەبەر خاتری منیش ناخۆیت...؟!

- ناتوانم.

سەیری چاوەکانیت کرد... هەستت کرد قسەکانتی بە دڵ نییە... وا دیار بوو پێی خۆش نەبوو خاتری بشکێنیت... کەمێك بیرت کردەوە و پێیت گوت:

- نەخۆشم بۆیە ناتوانم هیچ بخۆم... نەکەی بە شۆڕش باوەڕ بکەیت... من حەز دەکەم شت هەر بە دەستی تۆ بخۆم... هەموو جارێکیش، کە دەچیە حەمام، هەر بانگی من بکە، خۆم دێم پشتت دەشۆم.

وەك بڵێی ئەو ڕۆژەی بیر نەمابێت، کە لەناو چیمەنەکە مەحەلەبیتان دەخوارد و (شۆڕش) شەڕی پێ دەفرۆشتن، بۆیە زۆر بە سەرسووڕمانەوە لێت ڕادەما... دوایی گوتی:

- ڕاست دەکەیت، ئامانج گیان... هەر من دەزانم تۆ چەند منت خۆش دەوێت.

ئینجا ماچێکی قووڵی ناوچەوانتی کرد و گوتی:

- ئەگەر دەزانی چەندم خۆش دەوێیت، هەر باوەڕ ناکەی بە قوربانت بم.

سەرت خستە سەر ڕانی... ئەم بە دەستی ڕاست یاریی بە قژت دەکرد... بە چەپەیشی سووك سووك سنگی دەشێلای... پێیت گوت:

- حەز دەکەم لە باوەشت بخەوم.

بە سەرسووڕمانەوە لێت ڕاما و قسەکەتی دووبارە کردەوە:

- لە باوەشم بخەویت...؟!

- ئا، زۆر حەز دەکەم.

- بەڵام تۆ گەورە بوویت... لە باوەشم جێگات نابێتەوە.

- نا، دەمەوێ لە تەنیشتت بخەوم."

ئەو دیالۆگەی نێوان (ئامانج) و (دلارام) ئەو وڕێنانە دەردەخات، کە لە ڕێگەیەوە پەی





بە ئارەزووە سێکسییە پەنهان و فەنتازیاکانی (ئامانج)دەبەین، کە تاکە شوێنێکە ئەم ئازادانە بتوانێت خەونی تێدا ببینێت. لێرەدا (ئامانج) هێشتا کێشەی بە کۆمەڵایەتیبوون (**socialize**)ی هەیە، هەر ئەو کێشەیەیە، کە وای کردووە ئایدۆلۆجیای کەلتوور وەك ئەوەی (لاکان) ئاماژەی پێ دەدات بە تەواوەتی لە سیستەمی بیرکردنەوەیدا نەچسپیبێت، کە یەکێك لە هۆکارەکانی ئەوە دووربوونە لە پرۆسێسی بە کۆمەڵایەتیبوون، چونکە ئەم هەر لە منداڵییەوە لە کەسانی تر دوور بووە و تەنیا لە چوارچێوەی ماڵەوەدا ژیاوە. بەڵام بە هاتنی ماڵی (شۆڕش) هەموو هاوکێشەکان دەگۆڕێن.

بۆچی (ئامانج) دەبێتە پێشمەرگە؟ بۆ دەبێت بە شۆڕشگێڕ؟ کارەکتەرێك، کە تا سەر ئێسقان دەترسێت و شەرم دەکات، چ شتێك وا دەکات ببێت بە شۆڕشگێڕ؟ کارەکتەرێك، کە هەمیشە ئەوی دیکە لە فەرنتازیایدا ئامادەیی هەیە چۆن دەتوانێت ڕوو بکاتە شاخ و چەك هەڵبگرێت؟ ئایا پاڵنەری شۆڕشگێڕبوونی (ئامانج) ئەو ئایدۆلۆجیایەیە، کە باوەڕی پێیەتی یان تێکشکاندنی خودی خۆی و هەڵاتنیەتی لە ترس و شەرم و لاوازییەکانی؟

ڕووکردنە شاخ و بوون بە چەکدارێکی شۆڕشگێڕ یەکەم هەوڵی (ئامانج)ە بۆ خۆدزینەوە لەو هەموو ناکۆکییە سایکۆلۆجیانەی لەگەڵ خۆیدا هەیەتی، بەڵام دەبێت ئەوەیش بزانین ئەم کاتێك دەبێتە پێشمەرگە، کە هەموو یان زۆربەی کەسەکانی دەورووبەری خۆی لە دەست داوە. دایکی کە ناوی (ست ڕووناك)ە، لەگەڵ (شۆڕش)، (دلارام)، (داندی)، (ماهیڤان) بە ڕووداوی جیاواز جیاواز لە ژیاندا نامێنن. هاوکات بەر لەوە (ست ڕووناك)ی دایکی شووی بە (شێرزاد ناجی) کردووە و دووانەیەکی لێ دەبێت. بەڵام دوای ئەوەی (شێرزاد ناجی) دەگیرێت، ئەوا لە سێدارە دەدرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا (سۆزان) کە خۆشەویستەکەی (ئامانج)ە بەشێوەی نادیار لە (ئامانج) ون دەبێت. لەمەوە (ئامانج) کووخێك دروست دەکات و لە دەرەوەی شار دەژێیت، بەڵام دوای ئەوەی مەفرەزەیەکی پێشمەرگە ڕێگای دەکەوێتە ئەو کوخەی ئەم، ئەوا لەگەڵیاندا دەڕوات و دەبێتە پێشمەرگە. کەواتە بوون بە پێشمەرگە دوای هەموو تێکشکان و لەدەستدانە گەورەکانیەوە دێت.

سەرەتا دەبێت لەوە تێبگەین دیدگای کۆمەڵ بۆ پێشمەرگە هەمان دیدگا بووە، کە بۆ قارەمان یان پاڵەوان

هەبووە، واتە پێشمەرگە ڕۆڵی قارەمانی گێڕاوە، کە هەمیشە وێنەی قارەمان یان پاڵەوان لە دیدی ئەوانی تردا وێنەیەکی نموونەیی و تەواوکۆ یان پێرفێکتە. لەژێر ئەو ڕۆشناییەدا دەتوانین بڵێین (ئامانج) بەو بڕیارەی دەیەوێت بەو وێنەیە بگات، کە بە هۆی ترس، شەرم و دەیان بەربەستی دیکەی ناوەکی نەیتوانیوە پێی بگات. بەر لە هەر شتێك دەیەوێت لەو هەموو ناکۆکییە ناوەکییانەی خۆی ڕا بکات.
هاوکات (ئامانج) دەبێتە ئەندامی مەفرەزەی (پۆلا جەنگۆ)، کە یەکێکە لە ڕابەرە دیارەکانی پێشمەرگە. ئەندمانی ئەو مەفرەزەیە بە جەربەزەیی و جیاوازییەوە ناسراون، بەوەی، کە لە مەفرەزەکانی تر ناچێت و ناسراوترین مەفرەزەیە. ناوبانگی ئەو مەفرەزەیە بە تەنیا بۆ چالاکییەکانیان ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئەو کارەکتەرە جیاوازانەیش دەگەڕێتەوە، کە تێیدا ئەندامن. (ئاواز) یەکێکە لەو کارەکتەرانەی، کە ڕەگەزی دیار نییە، واتە کەس بە تەواوەتی نازانێت کوڕە یان کچە، وەك ئەوەی لەو پەرەگرافەدا (ئامانج) لەبارەی (ئاوازە)وە دەڵێت:
" هەر کە دەچووینە لادێیەکان، خەڵك بە پیرمانەوە دەهاتن و دەیانویست هەرچی زووترە لە نزیکەوە (ئاواز) ببینن... کاتێکیش پێیان دەگوترا (ئاواز) کچ نییە، ئەوان هەر باوەڕیان نەدەکرد... لە سیمای ورد دەبوونەوە و قژە خاو و برۆ باریکەکانیان دەبینی، وایان دەزانی درۆیان لەگەڵ دەکەن... دەیانگوت ڕاستە پیاو جلی ژنانە لە بەر بکات، دەبێتە ژن، بەڵام ژن ئەگەر جامانە و پشتێنی قارەمانەکانیش ببەستێت، هەر ژنە... هەندێکیان دەیانگوت سیمای پیاو دەشاردرێتەوە، بەڵام هیی ژن مەحاڵە... "
ڕەگەزی ڕاستەقینەی (ئاواز) بە درێژایی ڕۆمانەکە جێگای پرسیارە، بۆیە هیچ کات ڕوون نابێتەوە، کە کچە یان کوڕ. ئەو شێوازە کارکردنە لە دروستکردنی کارەکتەر زیاتر فرەدەنگی و جیاوازی بۆ ڕۆمان دەخوڵقێنێت، چونکە ڕۆمان دەبێتە سەکۆی گشت کارەکتەرە جیاوازەکان، کە هەر ئەو سەکۆ جیاوازەیە ڕۆمانی پێ دەناسرێتەوە. ڕۆمان، کە بەرهەمی مۆدێرنەیە، ئەو پاڕادایمە ئەدەبیە تێدەپەڕێنێت، کە ئیش لەسەر مانەوەی بەها پیرۆز و باوەکان دەکات. ئەو جیاوازییە، کە لە دواییدا ئاماژەی پێ دەدەین یەکێکە لە خەسڵەتە قووڵەکانی ڕۆمان.
(ئامانج) بەو شێوەیە باسی مەفرەزەکەی خۆیان دەکات:
" هەرچی بێت ئێمە مەفرەزەیەکی ئاسایی نەبووین... نازناوەکانیشمان وەکو خۆمان سەیر... (وریا باگوردان) بەو قەڵافەتە پتەو و تێکسمڕاوەی وەك باگردێن شتی دەپەستایەوە... (شێرۆ کوورە) لە کاتی تووڕەبووندا ئاگری لێ دەباری... (ئازۆ ئازووقە)





لە بنی بەردیش بووایە ئازووقەی پەیدا دەکرد... (ڕێبە تیترواسك) وەکو تیترواسك چاوەکانی لە تاریکیدا شتیان دەبینی... (کامۆ ورچە) لەناو بەفر سەرمای نەدەبوو... (دلۆ کەمتیار) لە دووری دوور دوورەوە بۆنی شتی دەکرد... (شاخۆ بەزمە) لەوپەڕی ناخۆشی و پەژارەیشدا لە بەزمی خۆی نەدەکەوت... (سەرۆ مەنجەنیق) بەردی بە قەدەر کفتەی هەولێرییانی لەم گوندەوە بهاویشتایە، لەو گوندەی ئەوبەر بەر ئەرز دەکەوت... چیرۆکی ئەو لەگەڵ بەرد تەواوبوونی نییە... (بەخە هەڵبەست) بۆ هەموو شتێك چیرۆکێکی هەڵدەبەست... (دارا گیاناس) هەموو گیایەکی دەناسی... چێشتی هەر بە گژوگیا لێ دەنا... منیش بە (کەڕولاڵی چەنەباز) بانگ دەکرام و تەنیا بە سەرلەقاندن وەڵامم دەدانەوە..."

لێرەدا هەڵبژاردن یان ناونانی کارەکتەرەکانیش بە شێوەیەکی زۆر جیاواز کراوە بۆ ئەوەی گوزارشت بێت لە خەسڵەتی کارەکتەرەکان، بۆیە دەبینین بۆ هەر ناوێك هۆکارێك بوونی هەیە، ئەوەیش هۆشیاریی ڕۆماننووس لە ناونانی کارەکتەرەکان دەردەخات. لە ڕێگەی ئەو ناو و خەسڵەتی کارەکتەرەکانەوە دەزانین، کە کارەکتەرەکان کەسانی ئاسایی نین. (ئامانج) یەکەم شت، کە دەیکات لە بەشداریکردن لە چالاکییەکانی شاخ قسەنەکردنیەتی، واتە بە تەواوەتی زمانی خۆی دەگرێت و هیچ قسەیەك ناکات. ئەگەرچی لە ڕۆمانەکەدا وا دەردەکەوێت لەبەر ئەوەیە، کە ئاشکرا نەبێت کوڕی ئەفسەرێکی بەعسە، بەڵام ئەو قسەنەکردنە بەشێکە لە پرۆسێسی هەڵهاتن لە ناکۆکییە قووڵە سایکۆلۆجییەکان، چونکە لە ڕێگەی زمانەوە زیاتر و زیاتر هەست بە ترس و شەرمەکانی دەکرێت، ئەمەیش ڕێگەی ئەوەی لێ دەگرێت ببێت بەو کەسایەتیەی، کە خەونی پێوە دەبینێت و دوور بێت لەو بەربەستە سایکۆلجییە قووڵانەی هەیەتی. قسەنەکردن دەستپێکی گەشتێکی جیاوازە بۆ ناوەوەی خود و ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەستە سەختەکانی، کە بە درێژایی چەندین ساڵ و بەهۆی چەندین دۆخی جیاوازەوە کەڵەکە بوون و هەمیشە وەك تارمایین بەسەر ژیانی تاکەوە بۆ ئەوەی بزانێت پێشتر لە کوێ بووە و بەرەو کوێش ئاڕاستەی دەکات. بۆ دەرچوون لە هەڕەشەکانی ئەو تارماییە کارەکتەرەکان بڕیای جیاواز دەدەن.

## ویستی ئازادی و تێکشکاندنی واقیع

زۆربەی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆمانە ئاڕاستەکردنی کارەکتەرەکانە بۆ دۆزینەوەی مانای ئازادبوونیان، چونکە ئازادبوون تاکە ویستێکی ڕاستەقینەی ئەوانە بۆ دەرچوون لە هەموو بەربەستە کۆمەڵایەتی، ئایینی، سیاسی، سایکۆلۆجی و کەلتوورییەکان. کارەکتەرەکان ویستێکی قووڵیان بۆ ئازادی هەیە، هەر لەبەر ئەوەیشە بەشێکیان دەچنە ڕیزی شۆڕش، (ئامانج) و (ئاواز) دوو نموونەی بەرچاون. بەشێکیان سەرهەڵدەگرن و ویستی تێکشکاندنی بەربەستەکانیان هەیە، کە خودی ئەو سەرهەڵگرتنە ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی ئازادی، (ئیمان) و (عیماد) دوو نموونەی بەرچاوی ئەو سەرهەڵگرتنەن. بەشێکیشیان بڕیاری گرنگ لە ژیانی خۆیان دەدەن بۆ دەرچوون لە دنیای ئەوانی تر و گەڕانەوە بۆ خۆ. بۆ نموونە (ئازاد) قورسترین بڕیار لە ژیانی خۆی دەدات ئەویش وازهێنانیەتی لە هاوڕێیەتی لەگەڵ (شێرزاد ناجی)، کە نزیکترین هاوڕێیەتی، بەڵام پاڵنەری ئەو بڕیارە ئازادبوونەیەتی، چونکە ئەو هاوڕێیەتییە بووەتە بەشێك لە لێسەندنەوەی ئازادییە خودییەکانی بە هۆی ئایدۆلۆجیای شۆڕشەوە. (دکتۆر پاریس) و (دڵپاك)ی هاوسەری کاتێك دەزانن ژیانیان مانای نەماوە، بڕیار دەدەن سەرهەڵبگرن و کۆچ بکەن بۆ لەندەن، بەڵام کاتێك ئاشکرا دەبن و مەفرەزەیەك دەیەوێت بچێتە سەرماڵیان، ژەهر دەخۆنەوە و خۆیان دەکوژن، خودی ڕووداوی خۆکوشتن بڕیارێکی ئازادانەیە دژی کۆیلەبوون و چوونە زیندان. (سۆزان)ی یەکەم خۆشەویستی (ئامانج) بۆ (دانمارك)سەر هەڵدەگرێت و دواین سەربردەکانی لە کەمپەکانی ئەوێ تەواو دەبن، لە کاتێکدا هەموو کەسەکانی خۆی بە چارەنووسی تراژیدییەوە لە دەست داوە. دیارترین نموونەی ئەو ڕۆمانە، کە ویستی ئازادیی کارەکتەرەکان دەردەخات، وازهێنانی (ئامانج)ە لە پێشمەرگایەتی و ویستی دروستکردنی کۆخێکە لە قەراغ شار، چونکە ئازادییەکانی خۆی لە شۆڕشیشدا نەدۆزیوەتەوە.



پێوەندییەکی زۆر قووڵ لەنێوان ئازادبوون و کۆتاییی تراجیدی لەو ڕۆمانەدا بوونی هەیە. هەموو ئەوانەی بۆ ئازادیی هەوڵدەدەن بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕووبەڕووی دۆخی تراجیدیی دەبنەوە. (شێرزاد ناجی)ی شۆڕشگێڕ لە سێدارە دەدرێت بەهۆی ئەو سەرکەشییە ترسناکانەی لەپێناو شۆڕشدا دەیکات، چونکە لای ئەو شۆڕشی نوێ تاکە ڕێگەی ڕزگاربوونی مرۆڤی کوردە. (هەژار)، (ماهیڤان) و (شۆڕش) دەکوژرێن بەهۆی ئەوەی ڕێکخراوێك دروست دەکەن و دواتر ئاشکرا دەبن. (ئازاد) ڕووبەڕووی حاڵەتێکی قووڵی دەروونی و نەخۆشیی جەستەیی دەبێتەوە، کە ئاماژەیە بۆ ئەو قورساییە زۆرەی بە



هۆی بڕیاری ئازادبوونەوە ڕووبەڕووی بووەتەوە. چەندین نموونەی تری تراجیدی، بەڵام ئامانجی سەرەکیی تێمای ئەو ڕۆمانە هەوڵی قووڵی کارەکتەرە جیاوازەکانە بۆ ئازادبوون. گەڕانەوە بۆ مێژووی ڕووداوەکان گەڕانەوەیە بۆ دۆزینەوەی ئەو ویستە قووڵەی کارەکتەرەکان بۆ ئازادبوون هەیانە، کە ئەو ویستە چەندین دەرکەوتەی جیاوازی بەدوای خۆیدا هێناوە. خودی هەڵگیرسانی شۆڕش وەکو ڕێگەیەکی تری ئازادبوون لەو ڕۆمانەدا وێناکراوە. ویستی قووڵی هەندێك لە کارەکتەرەکان بۆ شۆڕش دەگەڕێتەوە بۆ بەرگریکردن لە ئازادیی خۆیان. بۆیە ئیشکردن لە ڕابردوودا لەو ڕۆمانەدا دۆزینەوەی ڕێچکەی مێژوویی ئێمەیە بۆ ئازادبوون، کە تەواوی ئەو ڕێچکە مێژووییە بۆ ئازادبوونە. (جۆرج ولیام فریدریچ هێگڵ) ڕابردوو وەکو قودرەتی تێگەیشتن و بوون بەوەی، کە دەمانەوێت بە پشت بەستن بەو مێژووەی، کە تواناکانی مرۆڤ دەسەلمێنێت، وێنا دەکات. لە دیدی ئەودا مرۆڤ بە چەندین ڕێگای جیاواز دەیەوێت تێبگات. بۆیە لە ڕەوتی مێژوودا مرۆڤ بە شێوەی جیاواز گوزارشت لە خۆی دەکات، ئێستاتیکا، ئایین، فۆرمە فەلسەفی و هونەریەکان پێزانینی تێگەیشتنی خودیمان بۆ حەقیقەت دەردەخەن. فەلسەفە ئاشکراتر حەقیقەتەکان پێشان دەدات، بەڵام لە هونەردا حەقیقەت بۆ شێوەی جیاواز دەگۆڕێت. ئەو گۆڕینە هانمان دەدات و هەڵچوون دروست دەکات لە بواری یاسا، ڕەوشت، نەریتی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسەتدا. لێرەدا ڕۆڵی تێکستیش هەمان ڕووبەڕووبوونەوە و یاخیبوونە لە بەرانبەر گشت نەریتە باوەکانی کۆمەڵگە، سیاسەت و ئابووری.

خاڵێکی تر لەبارەی ئەو کارەکتەرانەی ویستی ئازادیان لەو ڕۆمانەدا هەیە ئەوەیە، کە بەردەوام دۆخی ژیانی خۆیان دەگۆڕن و لە دۆخێکی دیاریکراو و چەقبەستوودا نامێننەوە. ئەو گۆڕانە خودی گەشەکردنی ئەو کارەکتەرانەیە، کە بەردەوام ڕووداوی جیاواز دەخوڵقێنن. ئەو ڕووداوانە مێژووی کارەکتەرەکانی دروست کردووە. ئێمە کاتێك دەزانین ئەوان هەن، کە بەهۆی گەشەکردنیانەوە ڕووداوی گەورە دروست دەکەن و هیچ کاتێك هەست بە جێگیربوونی دۆخەکانیان ناکەین. گەشەکردنی مرۆڤ گەشەکردنی ئازادییە. (هێگڵ) ئەو گەشەکردنە بە ویستی ئازادییەوە دەبەستێتەوە. بۆیە پێی وایە ویست و توانای مرۆڤایەتی بۆ ئازادی ناکۆتایە. هەموو مرۆڤەکانیش لە ئەنجامدا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن دۆخێك دروست

بکەن، کە تێیدا ئازاد بن. (هێگڵ) تەنانەت ئامانجی هەموو مێژوو دەخاتە خزمەت ئازادییەوە. بۆیە پێی وایە گرنگیی مێژوو لەوەدا نییە، کە چیی تێدا ڕوو داوە و چ ڕووداوێك باس نەکراوە. بەڵکو گرنگییەکەی ئەوەیە، کە ئەو ڕووداوانەی ل ەخۆی هەڵگرتوون چەندە لەپێناو هێنانەدیی ئازادی (Actualization of Freedom)دایە. بۆیە کاتێك ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) باس لە مێژووییەکی دیاریکراو دەکات، ئەوا بەدوای هەمان ئەو خاڵەدا دەگەڕێت، کە ئەو گەشەکردنە چەندە ئازادیی بەدوای خۆیدا هێناوە و تێکۆشانی کارەکتەرەکان چۆن بووە. کارەکتەرەکان ڕووداو دەخوڵقێنن بۆ ئەوەی ئازاد بن. (هێگڵ) دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە ڕووداوەکانی مێژوو گەشەکردن و ئازادیی مرۆڤیان بەدوای خۆدا هێناوە. بۆیە لەو ڕۆمانەیشدا هەموو ڕووداوەکان بە شێوەیەك ڕایەڵ کراون، کە گوزارشت بێت لە گەشتی کارەکتەرەکان بۆ ئازادبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کارەکتەرەکان ڕووبەڕووی دۆخی تراجیدی دەبنەوە. بۆ نموونە کوژراون و سەرهەڵگرتن. لە دیدی (هێگڵ)دا چەندە مرۆڤ ڕێگای جیاواز بۆ ئازادبوون دەگرێتە بەر، هێندە ئەو ڕێگا جیاوازانە دۆخی جیاوازیان لە مێژوودا دروست کردووە. هەر لەبەر ئەوەیە بەهۆی ئەو گەشەکردن و هەوڵانەی مرۆڤ بۆ ئازادبوون مێژوو بووەتە شوێنی قەسابخانەی کوشتن (Slaughter bench )، کە هەمان ژینگەی توندوتیژی و کوشتن لەو ڕۆمانەدا دەردەکەوێت. (کاروان کاکەسوور) دەیتوانی مێژووی کارەکتەرەکان لەو کوشتنە بە دوور بگرێت، بەڵام خودی پرۆسێسی ئازادیی پێویستی بە وەها ژینگەیەکە بۆ ئەوەی گوزارشت بێت لە دۆخی مێژوویی بۆ بەدەستهێنانی ئازادی.

(هێگڵ) لە کتێبی (فەلسەفەی مێژوو – The Philosophy of History) چەمکی (ڕیترۆئەکتیڤ - Retroactive) بە کار دەهێنێت، کە مەبەست لێی گەڕانەوە و دروستکردنی پێوەندییە بە شتێك، کە لە ڕابردوودا ڕووی داوە. لە ڕێگەی ئەو گەڕانەوەیە دەتوانین سەرلەبەری مێژوو بخەینە ژێر پرسیارەوە و هەڵیبوەشێنینەوە. بۆیە ڕیترۆئەکتیڤ بۆ ئەوە نییە بزانین چی ڕووی داوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەوەی ڕووی داوە هەڵیبوەشێنینەوە و بەها ڕاستەقینەکانی بدۆزینەوە. (کاروان کاکەسوور) لە ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان)دا بۆ ئەوە نەگەڕاوەتەوە مێژووی چل ساڵەی ڕابردووی ئێمە تاکو وەك مێژوو پێشانی بداتەوە، بەڵکو ئیشی کردووە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی بەدرێژایی ئەو ماوەیە ڕووی داوە لەپێناو دەرخستنی دیوە شاراوەکانی و خوێندنەوەیەکی قووڵتر بۆ ڕەوتی مێژوو، کە ویستی ئازادیی کارەکتەرەکانی لە خۆدا حەشار داوە. بۆیە هەموو ڕووداوەکان ڕایەڵە کراون بۆ ئەو





ویستە قووڵەی کارەکتەرەکان بۆ ئازادیی هەیانە لە دەرەوەی ئەوەی ئەو کارەکتەرانە کێن و چ پێناسێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، یان کەلتووریان پێ بەخشراوە. کارەکتەرەکان لە دەرەوەی دوالیزم و حوکمی جیاوان.

لە ڕۆماندا پێچەوانەی داستانی قارەمان و کتێبی ئایینی، مەودایەك نامێنێتەوە بۆ دوالیزمەکان، قارەمان و بێهێز، جەللاد و قوربانی، شەیتان و فریشە و زۆر دوالیزمی دیکە تێك دەشکێندرێن، چونکە ڕۆمانی فرەدەنگ ئەو کاتە لە دایك دەبێت، کە هەڵگری زمانی ئازاد و سەربەخۆی کارەکتەرە جیاوازەکان بێت. (باختین) بۆچوونی وایە ئەگەر کارەکتەر لە زماندا ئازاد نەبێت مانای وایە لە بنچینەدا ئەو کارەکتەرە دروست نەبووە. تاکە ڕێگەیەك، کە ئێمە لێیەوە هەست بە بوونی کارەکتەر بکەین زمانە، بۆیە کارەکتەر تەنیا لە ڕێگەی زمان، ئەویش زمانی ئازادیی خۆی دەخوڵقێت. بۆ نموونە ئەو مەفرەزەیەی (پۆڵا جەنگۆ) ئەگەرچی بەشێکە لە ئایدۆلۆجیای شۆڕش، بەڵام سەکۆی دەیان کارەکتەری جیاوازە. زمانی گوزارشتکردنی (شێرزاد ناجی) زۆر جیاوازە لەو زمانەی، کە بە هۆیەوە بەر (ئازاد) دەکەوین. ئەو ڕێگایانەی (ئامانج) بۆ گوزارشت کردن لەو هەستانەی بۆ (سۆزان) یان هەر کارەکتەرێکی تر هەیەتی، زۆر جیاوازە لەو زمانەی (سۆزان) بۆ گوزارشتکردن لە خۆشەویستی بەکاری دەهێنێت.

ئەگەر ڕۆمانی (کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان) ڕۆمانێکی مێژوویی بووایە و گوزارشتی لە کۆمەڵێك ڕووداوی مێژوویی کردبا بەبێ ئەوەی ئەو ڕووداوانە هەڵبوەشێنرێنەوە، واتە ئەگەر تەنیا ستاییشی شۆڕش و بەهاکانی بکردایە، ئەوا لە ئەدەبێکی تەقلیدی زیاتر نەیدەتوانی شتێکی تر بێت. ڕۆمان ئەرکی گواستنەوەی ڕووداوەکان نییە وەك ئەوەی، کە هەبوون، بەڵکو ناوەڕۆکی ڕۆمان سەرلەنوێ دارشتنەوەی ڕووداو و ڕابردووە بە دیدگایەکی جیاوازەوە. ڕۆمان بۆ ئەوەی بتوانێت شتی نوێ بدۆزێتەوە پێوستی بەوەیە دیدگای نوێی لە خۆ گرتبێت. (مارسێل پرۆست) پێی وایە کرداری ڕاستەقینەی دۆزینەوە گەڕان نییە بەدوای سەرزەمینی نوێ، بەڵکو بینینە بە دیدگا و چاوە نوێیەکان. ئەوەی لە ڕۆمانی(کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان)یشدا هەیە گەڕانێك نییە بەدوای ڕووداوە مێژووییەکانی شۆڕش، بەڵکو بینین و دارشتنەوەی ڕووداوەکانە بە دیدگای نوێوە.

## سەرچاوەکان


1. کەناڵی مەیموونە چەکدارەکان/ ڕۆمان/ نووسینی: کاروان عومەر کاکەسوور/ لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ چاپی یەکەم 2011

2. Said, Edward W. / Culture and Imperialism/ New addition, Published by Knopf Doubleday Publishing Group, 2012

3. Marx, Karl / A Contribution to the Critique of Hegel`s Philosophy of Right/ First published: in Deutsch-/FranzösischeJahrbücher, 7 & 10 February 1844 in Paris
https://www.marxists.org/archive/marx/works/1843/critique-hpr/intro.htm

4. Marx, Karl / Capital, A Critique of Political Economy/ First English edition of 1887 (4th German edition changes /included as indicated) with some modernisation of spelling
https://www.marxists.org/archive/marx/works/download/pdf/Capital-Volume-I.pdf

Berdyaev, Nicolas / The Origin of Russian Communism/ Printed in Great Britain by Robert MacLeh and Company Ltd The University Press / Glasgow for Geoffrey Bles Ltd 52 Doughty Street Londoı Published 1937 /New Edition 1948
http://www.jesus-for-all.com/fikr/pdf_3189.pdf

.Mill, John Stuart / Utilitarianism/ Chapter two: What Utilitarianism is
http://www.colorado.edu/philosophy/heathwood/pdf/mill.pdf

7. Bentham, Jeremey / An Introduction to the Principles of Morals and Legislation/ Batoche Books/ Kitchener/ 2000
http://socserv.mcmaster.ca/econ/ugcm/3ll3/bentham/morals.pdf

8. Freud, Sigmund / A General Introduction to Psychoanalysis. 1920/ Part Three: General







Theory of the Neuroses/ XXV. Fear and Anxiety

http://www.bartleby.com/283/25.html

Freud, Sigmund / (1898). Sexuality in the etiology of the neuroses. S.E., 3, 261-286 .9

Freud, Sigmund / Complete Works .10

http://postausderprovinz.files.wordpress.com/2013/10/sigmund_freud_complete_works.pdf

Hyldgaard, Kirsten / Sex as Fantasy and Sex as Symtom .11

http://www.lacan.com/thesymptom/?p=142

Zizek, Slavoj / How to Read Lacan/ Granta Books/ London .12

هەروەها لەم لینکەیشدا دەتواندرێت ئەم کتێبە بخوێندرێتەوە:

https://www.uploady.com/#!/download/ZRuvRbXyta8/T~b5aQoH_PSEXAR0

Homer, Sean/ Jacques Lacan/ Routledge Critical Thinkers; Essential Guides for Literary Studies .13

http://www.8pic.ir/images/vpm6edho42t33u9wguoj.pdf

Hegel, Georg WihlemFridrich/ The Philosophy of History/ With Prefaces by Charles Hegel and the Translator J.Sibree, M.A./ Batoche Books/ Kitchener 2001 .14

# وەکو خوێن لە دەمارەکانمدا

سێ نامەی شاملوو بۆ ئایدا

و. لە فارسییەوە: بەیان ڕەشیدی

1

ئایدای من، ئایدا باشەکەم!

سەعات چوار، یان چوارونیوە، هەوا خەریکە ڕوون دەبێتەوە. خەوم دیت، بەڵام لەبەر کێشە زۆرەکانم ناتوانم بخەوم. پێویستە "کار" بکەم؛ کارێك کە بەداخەوە بۆ بەختەوەریی



من و تۆ نییە، بۆ ئامانجی خۆیشم نییە، بۆ بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیشم نییە، بۆ هیچ شتێك نییە: بۆ کۆتاییهێنان بە ئەحمەدی تۆیە؛ بۆ ئەوەی ئیدی ـ خۆت وتەنی ـ هیچ شتێك لە ئەحمەدت بۆ نەهێڵنەوە.

بەڵام... با وا بێ. ئەمانەش کۆتاییان دێت. هەرچۆنێك بێت، سبەی هی ئێمەیە، هی من و تۆ پێکەوە، هی ئایدا و ئەحمەد پێکەوە...

هەرچۆنێك بێت، ئەو شەوانە دێن کە تا بەیانی لە لات بەخەبەر بمێنمەوە، سەرت بخەمە سەر سنگم، پێت بڵێم چەندە لای تۆ خۆشبەختم.

چەندە خۆشم دەوێیت! چەندە پێویستم بە هەناسەی تۆیە لای خۆم! چەندە قسەم پێیە بۆت! بەڵام بەداخەوە، هەموو قسەکانی ئێمە بوون بەمەی تۆ بڵێی "ئەمڕۆ ماندووی"، یان "سەیرە، ئەمڕۆ دڵت خۆشە!" و من پێت بڵێم: "ئیتر کەی دەتوانم بتبینم؟"، یان تۆ بڵێی: "دەمەوێ بڕۆم، کاتێك لێرەم فریای کارەکانت ناکەوی".

من بڵێم: "شڕوشێت! چەند خولەکێکی تریش دانیشە!".

هەر ئەمە و ئەمە و ئەمە...

هەموو ئەو قسانە، ئەو شیعر و سروودانەی لە ڕۆحی مندا کڵپە دەسەنن، بوون بەم قسە و دیدارە گاڵتەئامێزانە، کە دەمترسێنن؛ ترسی ئەوەی وردەوردە تۆ لەم دیدارانە، لەم قسانە و دواجار لە ئەشقێك کە شوێنی خۆی نادۆزێتەوە، تا باڵێك بکاتەوە، تووشی نەفرەت و بێتاقەتی و خەم بیت.

لەم کاتەی شەودا "یان باشترە بڵێم بەرەبەیان" لە وێناکردنی کارەساتێکی وەها هەڵدەلەرزێم. وازم لە کار هێنا، بۆ ئەوەی ئەم چەند دێڕەت بۆ بنووسم:

ئایدای من، ئەم باڵندەیە، لەم قەفەسە تەنگەدا ناخوێنێت. ئەگەر دەبینی خنکاو و لاڵ و بێدەنگە، لەبەر ئەوەیە... لێگەڕێ فەزا و شوێنی خۆی پەیدا بکات، تا ببینی چۆن لە تاریکترین شەوەکاندا، هەتاویترین ڕۆژەکان دەهۆنێتەوە...

بۆم بنووسە تا هەموو چرکە و هەموو ساتێك بتوانم بیبیستم. بۆم بنووسە تا دڵنیا بم تۆش وەکو من چاوەڕوانی ئەو شەوە سپییانەی.

بۆم بنووسە کە دەزانم ئەم بێدەنگی و بێنرخییە دەرهاویشتەی ژیان لەم زیندانەیە، کە هی ئێمە نییە، کە موڵکی

ئێمە نییە، کە شایانی ئێمە نییە...
بۆم بنووسە تۆش چاوەڕوانی سپێدەیەکی، کە باڵندەی ئەشقی ئێمە تیایدا ئاواز دەچڕێ...

ئەحمەدی خۆت
٢٠/ سپتامبەر/ ١٩٦٤



2

ئایدای من!
ڕێم بدە سەرەتا پێت بڵێم نووسینی ئەم نامانە هەوڵی منن بۆ ئەوەی هۆکارێك بن تا باشتر یەکتری بناسین، لەبەر ئەوەی بەداخەوە ناتوانین چەند سەعاتێك زیاتر پێکەوە بین. زۆر زۆر جێگەی داخە ئەو سەعاتە کورتانەی دیدارمان، تەنیا بە دوو شت بەسەر دەبەین: هەوڵی من بۆ بەقسەهێنانی تۆ و پڕکێشی و سووربوون و هەوڵی تۆ بۆ ئەوەی بێدەنگ بیت و هیچ نەڵێی.
لەو سەعاتە کورت و زۆرجار ڕەسمی و ناڕەحەتانەی کە دەتوانم بتبینم، هەموو کاتەکە بەوە تێدەپەڕێ کە تۆ ناچاری قسەکردن بکەم، بەڵام زۆر جێگەی داخە لەو هەوڵە ئەنجامێکم چنگ ناکەوێ، چونکە ئەگەر دواجار شتێکیش بڵێی، جگە لە "ڕەنگە" و "نازانم" و "لەوانەیە" و وشەی لەم جۆرە، ئەگەر قسەی تر بکەیت، دیسان لە بازنەی دێڕی کورت و دوولایەنە و ناڕوون و تاریك تێناپەڕێ. وەختێك دەمانەوێ لە یەکتر جیابینەوە، بەوپەڕی داخەوە دەبینم جگە لە قسەکانی جاری پێشوو، شتێکی زیاترم نەبیستووە. لەوە زیاترم بەدەست نەهێناوە و زانیارییەکی زۆرترم



لەبارەی تۆ، شێوەی بیرکردنەوەت، ئارەزووەکانت، هەست و ژیانت دەست نەکەوتووە؛ شتێکی تر کە هەرگیز نەمتوانیوە لە دەمی تۆوە دەریان بهێنم.

دوای چەند جارێك بینین و قسەکردنم لەگەڵت، ئەمشەو دەمەوێ دەربارەی تۆ بیر بکەمەوە و هەڵسەنگاندن بکەم. دەبینم هەر ئەوەندە شت دەزانم و بە هەمان ئەندازە دەتناسم، کە پێش ئەم دیدارانە، کاتێك لە دوورەوە تۆم لە باڵکۆنی خانووەکەتانەوە دەبینی، لەبارەتەوە دەمزانین.

زۆر بمبوورە ئایدای من! لەم قسەیەی کە دەمەوێ بیڵێم، زۆر بمبوورە، بەڵام بەدبەختانە جگە لە دەربڕینی ئەم قسەیە، چارێکی ترم نییە...

بابەتەکە بۆ من لە ڕادەبەدەر جیددییە. پیاوێکم لەناو کۆمەڵگە و خەڵکی ڕۆشنبیر گرنگی و ڕێزێکم هەیە، زیاد لەوەی کە پێویستە... لە ژیانمدا دوو جار شکستم هێناوە و ئەم شکستانە بۆ من گرینگییەکی زۆریان بووە، چونکە بوونە هۆکارێك تا لە ئامانجەکانی ژیانم جێ بمێنم.

من لە ژیانمدا کۆمەڵێك ئامانجی دیار و ڕووناك و لە هەمان کاتدا پرشنگدارم هەیە، کاتێك دەڵێم لە ژیانی ڕابردوومدا شکستم هێناوە، مەبەستم ئەوەیە بەداخەوە ئەو ژنانەی لەگەڵمدا ژیاون، خاوەنی ئامانج و بەرنامەیەك نەبوون... ئەم شکستانە تا ئەو ڕادەیە ڕۆحی منیان ئازار دابوو کە بڕیارم دا لە سووچی ماڵەکەمدا دانیشم و نەیەمە دەرێ. تەنیایی و بەتەنیامانەوەم لا باشتر بوو لە هاوسەرگیری و دیسانەوە پێکهێنانەوەی خێزان، "بە هەرحاڵ" ژیان لەگەڵ ژنێکدا کە بۆ جاری سێیەم ڕووبەڕووی شکستم بکاتەوە. بیرم لەوە کردبووەوە باشترین ڕێگە بۆ شکستنەهێنان لە ژنومێردایەتیدا، هاوسەرگیری نەکردنە، بەڵام چارەنووس حوکمێکی تری کرد و من و تۆی خستە سەر ڕێگەی یەکتری.

جارێکی دی "بە دڵنیاییەوە بۆ دواجار" ئەشق هات بۆ لام، ئەمجارە بە جۆش و گەرمییەکەوە هات، کە ناچاری کردم ددان بەوەدا بنێم، پێشتر تامی ئەشقم نەکردبوو، بەڵام بەم ئەشقە، لەوپەڕی ترسەوە دەبینم، کۆمەڵێك ئازاری نائاشنا وردەوردە چنگ بە ڕۆح و دڵمدا دەکەن.

ئایدا! لێگەڕێ بەبێ پێشەکی ئەم نهێنییەت لا دەربڕم، کە من لە ئەشقدا، زیاتر لە هەر شتێك و زیاتر لە



چێژەکان، بڵێسە و گڕوتینەکەیم دەوێ. زیاتر لە هەر شتێك، تاسە و تامەزرۆییەکەیم لا پەسەندە. زیاتر لە هەر شتێك، نائارامی و بێقەرارییەکانیم دەوێ... بێدەنگیی تۆ، شیعر لە ڕۆحمدا وشك دەکا. شیعر ژیانی منە؛ قسەکانی تۆ مایەی سەرەکیی ئەم ژیانەن و دەبێ مایەی سەرەکیی ئەم ژیانە بن.
ئەگەر بە تۆ بڵێم ئایدا! ئەم هەموو پڕکێشییەی من دەیکەم بۆ ئەوەی بێتە قسە، لە ڕاستیدا تەنیا لەبەر هاتنەقسەی تۆ نییە، لەبەر ئەوەیە ژیانم بۆ بگەڕێتەوە.
پیاوێك کە بە هەموو جۆشوخرۆشەوە ئاشقە، پێویستی بە قسەکانی تۆیە... ئەگەر تۆ بتەوێ هەر بەم جۆرە درێژە بە بێدەنگی بدەی، ناڵێم جێت دەهێڵم و دوای ژیانی خۆم دەکەوم، نا.. چونکە جگە لە لای تۆ، جێگەیەکم نییە، بەڵکو دەمەوێ بڵێم، ئەگەر ئەم بێدەنگییە بەردەوام بێت، بە زوویی تەنیا تەرمێکی سارد و مردوو لە باوەش دەگریت، کە تاکە نیشانەیەك لە ژیاندا هەر ئەوەیە هەناسە دەدات. دەمەوێ بڵێم؛ بێدەنگیی تۆ، کۆتایی غەمگینی ژیانی منە.

قسە بکە ئایدا! قسە بکە!
پێویستم بەوەیە گوێم لە قسەکانت بێ. بۆم بدوێ لە ئەشقت، لە دڵت، لە ئارەزووەکانت. ئەگەر منت خۆشدەوێ، پێویستمە لە زمانی خۆتەوە بیانبیستم؛ هەموو ڕۆژێك، هەموو سەعاتێك، هەموو خولەکێك، هەموو ساتێك دەمەوێ زمانی تۆ، دەمی تۆ، دەنگی تۆ ئەو شتەم بۆ بڵێنەوە. بەداخەوە بێدەنگیی تۆ وردەوردە ڕێ لە قسەکردنی منیش دەگرێ. درەخت بە بەهار و ماسی بە ئاو دەژی، منیش بە قسەکانی تۆ.
من بە تۆفان دەژیم... تۆفانێك لە نازکێشانەکان و دێڕەکان. من ئەشق و ژیانم لە تۆفانە پڕ هەراوزەناکاندا ئەدۆزمەوە.
ئەم بێدەنگییە سامناکە بەسە، بیشکێنە! ئەو نائومێدییەم لێ دوورخەوە کە بەو بێدەنگییە ترسناکە دروستت کردووە. من لەوە هەستیارترم کە پێت وا بێ بتوانم لەم دۆخە نائاسوودەیەدا بژیم.



ئایدای من! تو ئەو خودایە! بە هاوارەوە ئەشقەکەتم پێ بڵێ، تا باوەڕ بکەم. پێش ئەوەی لە ترسناکیی ئەم بێدەنگییەدا شێت بم، بە هاوارەوە ئەشقەکەتم پێ بڵێ، لەگەڵم بدوێ، قسە بکە، قسە بکە، قسە بکە، جۆشوخرۆشی ئەوەم پێ بدە کە لەو نائومێدییەی دەوری داوم، ڕزگارم بێ... قسە بکە! پێش ئەوەی لەوپەڕی نائومێدی و پەرێشانیدا باوەڕ بە خۆم بهێنم کە (نا! ئەشق نییە و من تەنیا گاڵتەجاڕێك بووم) قسە بکە، ئەمە تاکەڕێگەی ڕزگاریی منە. قسە بکە ئایدا!.

تاران- جون/ ١٩٦٢

**3**

ئایدا! ترپەکانی دڵم

وەڵامی خەڵکی خوا بدەرەوە؛ وەڵامیان بدەرەوە... پێم دەڵێن چی بووە چیتر شیعر نانووسم؟ چی بووە چیتر شیعریان بۆ ناخوێنمەوە؟ چی بووە چیدی گوێیان لە دەنگم نییە؟

وەڵامیان بدەرەوە دیسان.

پێیان بڵێ ئەحمەدی تۆ لە هەمیشە زیاتر بیر لە شیعر دەکاتەوە، لە هەمیشە زیاتر شیعر دەنووسێ و لە هەمیشەش زیاتر شاعیرانە دەژی... بەڵام ـ ئەمەشیان پێ بڵێ ـ ئەو شیعرانە تەنیا یەك بابەتیان هەیە و: "خۆشەویستیی ئایدا!". ئەوەیان پێ بڵێ. بڵێ کە تۆ هەر ترپەیەکی دڵی منیت، بڵێ کە خۆشەویستیی تۆ بووەتە هەموو کار و ژیانم، بڵێ



که جگه له تۆ، بیر له هیچ شتێك ناکەمەوە... ئایدا گیان! هەموو ئەمانەیان پێ بڵێ. ئەگەر کێشە شاعیربوونە، پێیان بڵێ من گەورەترین شاعیری جیهانم، نەك لەبەر هیچ کام لەو شیعرانەی تا ئێستا نووسیومن... نەك لەبەر هەوای تازە، نەك لەبەر باخی ئاوێنە، نەك لەبەر پاریا کە بۆخۆی هیوایەکە، نەك لەبەر کچەکانی نەنەدەریا کە ئازار و کەسەرێکە، نەك لەبەر شەوانەکان و نەك لەبەر تا شکۆفەی سووری کراسێك، کە گەورەترین شیعری فارسیی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمە... نا، لەبەر هیچ کام لەمانە نا؛ بەڵکو تەنیا و تەنیا لەبەر ئایدا؛ لەبەر تۆ کە جوانترین شیعری منی. لەبەر تۆ، شیعری ژیانی من. هەموو ژیانی من... لەبەر تۆ.

ئەشقی تۆ، لێبووردن و چاکە و گەورەیی تۆ و ویقاری تۆ، بوونی تۆ، دڵت ـ کە وەك پەپوولەیەك ناسك و بچووك و ئاشقە ـ چاوەکانت کە وەك جامی شەرابن و ڕۆحت!

ئایدا! تۆ وەك خودا جوانی

چاوەکانت جوانترین چاوانێکن، مرۆڤ دەتوانێ بیانبینێ و نیگات هەموو هەتاوەکانی کاکێشانێکە و سپێدەی هەموو ئەستێرەکانە؛ لێوەکانت ئاوێنەیەکن، لە ناسکیی ڕۆحت دەدوێن و ڕۆحت ڕۆحی ویقار و هێمنییە. ڕۆحی تۆ خانمێك، ڕۆحی تۆ "لەیدی"یەکە. گەردنی بێ کەموکورت لە سەربەرزیی من دەچێت. کیبریایەك، پاڵپشتێك و دڵنیاییەکی ڕەهایە و بەژنت... هەردووکیان لە "شتێك" دەدوین.

بەڵام پێت وا نەبێ من تۆم لەبەر جوانییەکانت، تەنیا لەبەر چاوانی بێوێنە و نیگات کە پڕە لە ئەشق و سۆز، خۆشدەوی. ئایدای من! تۆ زیاتر لەبەر دڵمیت، لەبەر باشیتە خۆشم دەوێی. لەبەر ئەوەی تۆ تێکەڵەی جوانیی ڕۆح و جەستەی؛ لەبەر ئەوەیە دەڵێم، هەرگیز، نە پیری و نە... ناتوانێت لە جوانیت کەم بکاتەوە، چونکە تا جەستەت لەژێر فشاری ساڵەکاندا بشکێت، ڕۆحی جوانی تۆ جوانتر دەبێت و بەم جۆرە هەرگیز لەوەی کە ئێستا کۆی ئەم جوانییەیە، کەم ناکاتەوە.

خودای بچکۆلە!
لەناو باسکەکانتدا، لەناو ئامێزتدا جێم بکەرەوە، لەژێر پێت، لەسەر
ئەو زەوییەی هەنگاوت بەسەریدا ناوە، جێم بکەرەوە.
ئەوەندە خۆشم دەوێیت، هەندێك جار لە ترسا هەڵدەلەرزم. کارەکە
لەم قسانە تێپەڕیوە، باشە، ئێستا چی؟ پاش چوار مانگ بە کوێ
گەیشتووم. ساکارە؛ ئەشقی تۆ بە چەشنێ سەرڕێژی لەخۆباییبوونی
کردووم، کە هەست دەکەم خوداکان دەبێ لەسەر نووکی پێ باڵایان
بەرزبکەنەوە، تا بگەنە نیوەی بەژنی من.
***
خودای بچکۆلە! هیوای گەورە! هەموو شتێکی من! شادی و بەختەوەریی من!
ئێستا ئیدی ژیانی من جگە لە تۆ هیچ شتێك نییە.
ئێستا ئیدی، ئەو هەناسەیەی هەڵیدەمژم هیچ نییە جگە لە تۆ.
ئێستا ئیدی شیعری من، بیرکردنەوەی من، وێنای من، هیچ نییە جگە لە تۆ.
وەك منداڵان خۆشم دەوێیت؛ ڕێك بەو چەشنەی منداڵان دایکیان خۆشدەوێت. جوانیی تۆ ـ ئەگەرچی گرم تێ بەردەدات و دەمسووتێنێ و دەمکاتە خۆڵەمێش ـ ئیتر هۆکار و پاڵنەری خۆشویستن و ئەشقی من نییە. هەرجۆرێکت لێ بێت خۆشم دەوێی، تەنیا بەو مەرجەی ئایدای من بیت، تەنیا بەو مەرجەی "بزانیت بۆچی تۆم وەك منداڵان خۆشدەوێ".
ئیدی هەموو شتێکی من، جگە لە تۆ هیچ نییە. ئیدی تەنیا لەبەر تۆ زیندووم، واتە ـ باشترە بڵێین ـ تەنیا بەو دڵخۆشییە گەورەیە زیندووم، کە دەستەکانت، دەستەکانم دەلاوێننەوە و لێوەکانت ماچم دەکەن و دەزانم لە دڵتدا، لە ژووری بچکۆلەی کچانەتدا، من لە باشترین جێگەکان، لە بەرزترین جێگەکان دادەنێی... بریا دەمتوانی بێمە ئەوێ، بریا دەیانهێشت بێمە ژوورەکەت و ببینم کە چۆن خەیاڵت چەندین جار لەسەر سەقف و دەرگا و دیوار، وێنەی کردووم تا بە خۆم بنازم و بە خوداکان بڵێم: بەڵاتان بەرز بکەن، باڵاتان بەرز بکەن، ڕەنگە بگەنە نیوەی بەژنی من.

ئایدای بچکۆلەی من!



ژیانی من ئیدی هیچ نییە، جگە لە تۆ. من خۆیشم ئیدی هیچ نیم، جگە لە خودی تۆ. ڕوخسارت هەموو ژیانم لە ئاوێنەی واقعییەتدا دەنوێنێ و ئەم واقعییەتە ئەوەندە مەزنە، کە لە ئەفسانە دەچێت. تۆم خۆشدەوێ و ئەم خۆشویستنە ڕاستییەکە، دەمبەستێتەوە بە ژیان.

هەموو دڵخۆشییەکانم لە بزەیەکی تۆدا کورت دەبنەوە. هێندە بەسە کە شێوەیەکی غەمگین بە خۆت بدەی، تا من هەموو شادی و بەختەوەرییەکانی جیهان لە هێڵە بەیەکداچووەکانی ئەو ڕوخسارەی کە خودا دەزانێ چەندەم خۆش دەوێ، ون بکەم.

شەوی پێنجشەممە

20/ سێپتامبەر/ 1962

سەرچاوە:

*مثل خون در رگ‌های من، نامه‌های احمد شاملو به آیدا، نشرچشمه، 1394.

باوکە ئاسمان و دایکە زەوی و
منداڵە گێڕەشێوێنەکانیان

# باوکە ئاسمان و دایکە زەوی
# و
# منداڵە گێڕەشێوێنەکانیان

ئەفسانەی مەورییەکان لەسەر دروستبوونی ئەرز و ئاسمان و مرۆڤەکان

و. لەسوییدیەوە : **هیوا قادر**

## چۆن ئاسمان لە باوەش پیاداکردنە ئەبەدییەکەی خۆی لەگەڵ زەویدا جیائەبێتەوە

هەر لە سەرەتای یەکەم چاخی دروستبوونەوە تا چاخی دەهەمین، بەڵێ، تا سەدەمین و تا وەرچەرخانی چاخی هەزارەمینیش، ڕانگی ـ نوی، باوکە ئاسمان، هەروەها پاپا ـ تیو ـ نوکا، دایکە زەوی، بێ پسانەوە لە باوەشێکی ئەبەدیدا بەیەکترییەوە نووسابوون. لەو دەمەوەی جەستەیان ئاوا ڕاکشاو و ئاوێزان بوو هەر زوورەت بوو یەك لەدوای یەك لەدایك ئەبوون، منداڵەکانیان هەرگیز چاویان بە ڕووناکی ڕۆژ نەئەکەوت و لەناو تاریکییەکی بێ سەرحەددا درێژەیان بە ژیانی خۆیان ئەدا. ئەو تاریکییە بەردەوام درێژ ئەبووەوە. زەمەنێکی زۆر تێپەڕی، ئەم چاخ ئەدرایە دەم ئەو چاخ، کاتێکیش ئەو هەزاران چاخە یەك لە دوای یەکە بە کاوەخۆ تێپەین، منداڵەکانی ئەرز و ئاسمان بەدەست تاریکی و مەینەتی ژیانەوە شەکەت و ماندووبوون و هەموویان پێکڕا کۆبوونەوە و کەوتنە گفتوگۆکردن بۆئەوەی بزانن چی بکەن و ڕوو لە کوێ بنێن، وتیان:

ـ ئەبێت ڕۆژێك بێت لەدەرەوەی ئەو تاریکییە چڕەوە ژیان تاقیبکەینەوە، لەبەرئەوە با پێکەوە لەسەر ئەوە ڕێك بکەوین چی لە ڕانگی و پاپا بکەین. ئەو باشترین گۆڕانکاریەی ئەبێت بیکەین چییە ـ بیانکوژین یان ناچاریان بکەین لەیەکتری جیاببنەوە؟

تو ـ ماتوێنگا، یەکێك بوو لە سەرکێشترین و توندوتیژترینی ناو منداڵەکان، هەروەها لەبەرئەوەشی خودای جەنگ بوو، بێ هیچ چەند و چوونێك پێشنیازی کرد دایك و باوکیان بکوژن.

بەڵام تانێ ـ ماهوتا، کە خودای دارستان و هەموو بونەوەرانی ناو دارستان بوو، هاتە گۆ و وتی:

ـ من پێشنیازێکی ترم هەیە. باشترە تەنها لەیەکتریان جیابکەینەوە. ڕێگامان بدە با ئێمە ئاسمان بۆ سەر سەری خۆمان بەرزبکەینەوە و زەویش بخەینە ژێر پێمان. بۆئەوەی ئاسمان کەمێك دوور بکەوێتەوە و زەویش نزیکتر. تاکو زەوی ببێت بە دایکمان و بەخێومان بکات و بمانپارێزێت!

منداڵەکانی تر وتیان ـ باشە. سەربارى ئەوەی ئەم بیرۆکەیە هی تانێ بوو وردە وردە تو ـ ش هاوڕا بوو لەگەڵیاندا. لە کۆتایدا تەنها تاوهیری ـ ما ـ تێیا، خودای باو زریان مایەوە کە نەی ئەتوانی لە پێشنیازەکەی تانێ تێ تێبگات. سەربارى ئەوەی هەموو براکانی تری پێشنیازی جیاکردنەوەی دایك و باوکیان قبوڵ بوو بەڵام ئەو بەتەنیا دژیان وەستایەوە، چونکە ئەترسا مەملەکەتەکەی لەدەستبدات و ئەو کارەش ببێتە هۆی کوژرانی دایك و باوکی.



زەمەنێکی زۆر لە چاوەڕوانی و گفتوگۆکردن تێپەڕی بەڵام تاوهیری هەر ملی نەدا، منداڵەکانی ڕانگی و پاپا قیژاندیان بەسەریدا و وتیان ئێمە بێ تۆش ئەو کارە هەر ئەکەین.

سەرەتا ڕانگۆ ـ ما ـ تانێ، خودای گژ و گیا هاتە پێشەوە، سەرباری بەکارهێنانی هەموو هێزی خۆی بەڵام نەیتوانی دایك و باوکی لەیەکتری جیا بکاتەوە، کاتێك ناچار دەستی هەڵگرت، تانگارۆوا، خودای ئۆقیانووسەکان، کە لەدوای ئەوەوە لە نۆبەدا وەستابوو. بە هێواشی و خاترجەمیانەوە خۆی ترنجاندە نێوان سکی دایك و باوکییەوە، زۆر کۆششی کرد باوکە ئاسمان بەرزبکاتەوە. سەرباری ئەو هەموو باوەڕبوونە بە هێز و توانای بێ سنووری خۆی بەڵام نەیتوانی سەرکەوتووبێت، بۆیە ئەبوو بکشێتە داوە و ڕێگا چۆڵبکات بۆ هاومیا ـ تیکیتیکی، خودای هەموو ڕووەکە کێوییەکان، بەڵام ئەویش وەك ئەوانی تر هیچی پێ نەکرا!

بەڵێ، بەو جۆرە هەموو کوڕە جەسور و بەجەرگەکانی باوکە ئاسمان و دایکە زەوی خۆیان تاقیکردەوە، بەڵام هیچ کامیان سەرکەوتوو نەبوون. تەنانەت تو ـ ی کێویش سەرباری سەرشێتی و سەرچڵی خۆی نەیتوانی باوك و دایکی لەیەکتری جیابکاتەوە، تا ڕادەی قەپاڵ پیاداکردن و چەقاندنی دانەکانی لێیان و خوێن لەبەر ڕۆیشتنیان وەك ئاو.

ڕۆژێکیان بەخت یاری تانێ ـ ماهوتا بوو، ئەوەی خودای دارستان و هەرچی بوونەوەرەکانی ناوی بوو، بەهێواشی،

زۆر بەئەسپای، دەستیکرد بە گیرکردنی قاچ و پشتی لە هەردوو ورگی دایك و باوکی، تا زیاتر خۆی لێ گیرئەکردن ئەوان زیاتر جوڵەیان لە خۆیان ئەبڕی. دوای کەمێك پشوودان دووبارە دەستی کردەوە بە پاڵنان ـ سەر و شانی لە جەستەی دایکی گیر کرد، لە هەمان کاتیشدا پاڵی بە باوکییەوە نا بۆ سەرەوە. لەویادا بینیان چۆن ڕانگی ـ نوی، باوکە ئاسمان، هێدی هێدی و بەش بەش جەستەی بەرز ئەبێتەوە. ئەو ژێیانەی ڕانگی و پاپا یان پێکەوە بەستبوو تا ئەهات زیاتر ئەکشان، تا لە کۆتایدا قایم ئەکشان و لە جێی خۆیاندا ئەلەرینەوە و لە ناوەڕاستدا ئەقرتان، کاتێك دایك و باوکی تانێ ـ ئەو ژانی لەیەکترازاندنەیان پێگەیشت قیژەیەکی قایمیان لێهەستا، هەردووکیان لەتاو نائومێدی و ئازاری خۆیان هاواریان کرد:

ـ بۆچی وامان لێ ئەکەن؟ چۆن ئەبێت ئێوە حەز بە ئازاری دایك و باوکتان بکەن؟ بۆ لەیەکتریمان جیائەکەنەوە، لەکاتێکدا تەمەنای هەرە گەورەی ئێمە ئەوەیە بە بەردەوامی بەو جۆرە لەیەکتری نزیکبین و پێکەوە ژیان بەسەربەرین؟

بەڵام تانێ گوێی نەدایە هاوار و دادو بێدادیان، بەڵکە بە هەموو هێزی خۆی بەردەوام پاڵی بە دایك و باوکییەوە نا تا زیاتر دووری خستنەوە لە یەکتری، بەردەوام کۆڵینەدا تا ئاسمانی لەسەر سەری خۆی بەرزکردەوە و زەویشی بە قوڵی خستە ژێر پێیەوە.

ئەو دەمەی کارەکەی بە ئەنجام گەیاند، یەکەم شتێك کە ڕوویدا ڕووناکی بەسەر هەرچی بوونەوەرێکی زیندووی سەر زەویدا هەبوو ڕژا.

ڕووناکی لە ڕا ـ ی خۆرەوە گەیشت،
ڕووناکی لە مەرما ـ ی مانگەوە هات،
ڕووناکی لە ڤێتو ـ ی ئەستێرەکانەوە ڕژا،
ئاتاراپا ـ ی ڕووناکی بەرەبەیان،
هەروەها لە ئەتاهیکورانگی، ڕووناکی ڕۆژی ڕوونەوە گەیشت.

لێ ئەو خوێنەی بەدەم ئازارەوە لە باوکە ئاسمان ئەتکا، بوو بە بریقەی سوری خۆرئاوابوون، ئەو خوێنەشی لە دایکە زەویشەوە ڕژا ڕەنگی گڵی ڕووسوور کرد. دواتر ئەو ڕەنگە سوورە بوو بە ڕەنگێکی پیرۆزی مەوییەکان.

## تۆڵەی خودای زریان

تاوهیری ـ ما ـ تێیا، خودای با و زریانەکان، ڕقی لە براکانی هەستابوو چونکە بە گوێیان نەکرد و دایك و باوکیان بە کوشتندا، بۆیە بە چاوی پڕ لە کینەوە سەیری براکانی ئەکرد.

ئەو نەی ئەتوانی قبوڵی ڕووناکی و جوانی زەوی بکات، بە نیگایەکی ئیرەی پێبردن و ڕقەوە سەیری ڕەنگاوڕەنگی ڕەنگەکانی تانێسی دایکی کرد، لە کۆتایدا لە قینا لولیخوارد و بەرەو کەشکەلانی فەلەك هەڵکشا تا بگاتە لای باوکە ئاسمان و داوای ڕێنومای لێبکات.

هەردووکیان، تاواهیری و ڕانگی، پێکەوە گفتوگۆیەکی دوورودرێژیان کرد تا بزانن ئەتوانن چ تۆڵەیەك لەپای ئەو زوڵمەی لێیان کرابوو بکەنەوە. تا لەوێوە غەزەبی خۆیان بۆ یەك بەیەکی ئەو بوونەوەرانە ڕەوانەبکەن کە لەسەر زەوی ئەژیان. با و زریان لە نێوان ئەرز و ئاسماندا هەڵیکرد، هاژە و هوژەیان بەهەموولایەکدا بڵاوبوەوە؛ ئەو کاتە ڕاڕۆ خودای بای باکور، ڕاواهیتی خودای بای باشوور، تونگا خودای بای ڕۆژهەڵات و تاتووا خودای بای ڕۆژئاوا، هاتن.



هەرچی بای ترسێنەر و کەشوهەوای زریاناوی هەبوو هەڵیکرد: هەرچی شەپۆلی بای بەتاو و بای لولخواردووی وێرانکەر و هەوربەر بوو بوونە گەواڵەی تاریك و چڕ، پێکڕا لەگەڵ هەوری گەرم و هەوری ڕەشی قەترانی جڵەونەگیر و هەوری کێویدا سەرتاپای ئاسمانیان داگیرکرد.

لە ناوەڕاستی ئەو زریانە لە گوزارشت نەهاتووەدا کە هەرچی بای زریاناویی هەبوو تیایدا بەشدار بوو تاواهیری پێی خستە سەر زەوی. وەك بورکانێك پەلاماری تانێ ـ و ئەو دارستانە بەهێز و گەورەیەی سەر زەوی دا. درەختە بەژن زراڤ و بەخۆوە نازکەرەکان لە ناوەڕاستدا شکاند و قرچەیان کرد و بەدەم ناڵەیەکی گەورەوە کێشایان بە زەویدا و لەجێگای خۆیاندا زرم کەوتن و هەرلەویاشدا ڕزین و بوون بە پەین و خۆراکی مار و مێروو.

کاتێك تاواهیری هەرچی تووڕەبوونی خۆی هەبوو بەسەر تانێسی برای خودای دارستاندا ڕشتی و خۆی فڕێدایە ناو دەریاوە. بەقامچی کەوتە وێزەی دەریا تا خستییە سەر کەف، شەپۆلەکان هێندەی باڵای گردۆڵکەکان بەرزبوونەوە و خۆیان بە یەکتریدا کێشا، گەرداوێکی بەسام لەسەر ڕووی دەریا دەستی بە سەماکردن کرد. تانگارۆوا، خودای ئۆقیانووس، لە ترسا هەڵهات و چووە ژێر مەملەکەتەکەیەوە بۆ ئەوەی خۆی لەدەستی دەهریبوونی براکەی قوتار بکات. منداڵی منداڵەکانی تانگارووا توتێ ـ کە ناویان توتێ ـ ویهیویهی و ئیکا ـ تێرێ بوو نەیانتوانی لەسەر هەڵبژاردنی شوێنێکی سەلامەت لە جێگایەکدا لەگەڵ یەکتریدا ڕێکبکەون، بایەکی بەگرمە و ناڵەی بەهێزی ترسخەرەدڵ پەرتیکردن و قیژاندی بەسەریاندا تاکو دوای کەون.

.

توتێ ـ ویهیویهی، باوکی ئاژەڵە خشۆکەکان، ئەیویست ڕابکاتە سەر وشکانی، لە کاتێکدا ماسییەکان دوای ئیکا ـ تێرێ کەوتن و چوونە ژێر ئاوەوە. ئەوانەشی دوای تونێ ـ ویهیویهی کەوتبوون هاواریان بۆ ئیکا ـ تێرێ کرد:

ـ ئێوە ئەی حەپۆلینە کە بەرەو وشکانی ئەچن! ئەو دەمەی مرۆڤەکان ڕاویان کردن ئەوسا پەلپەلتان ئەکەن و لەناو تاوەی سەر ئاگردانەکانیاندا ئەتانبرژێنن!

توتێ ـ ویهیویهی وەڵامی دانەوە و پێی وتن:

ـ هەروەها ئێوەش، ترسنۆکی بێ عەقڵینە، ئەو دەمەی خۆتان ئەخزێننە ژێر بنی ئاوەوە، ئەبێت ئەوە بزانن کە مرۆڤەکان تۆڕەکانیان لە ئێوە و زەمبیلەکانیان لە سەوزە پڕ ئەکەن، لە نێوان خۆیاندا دابەشتان ئەکەن و ئەتانخەنە سەر چڵوچێوی ئاگراوی بۆ ئەوەی تامتان خۆشبێت و بتانکەن بە خۆراکی ژەمەکانیان.

لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ماسییەکان لە قوڵایی زەریاکاندا ژیان بەسەرئەبەن، ئاژەڵە خشۆکەکانیش لە ژێر لق و چڵی

درەختی ناو دارستانەکان و کون و کەلەبەرەکانی پاڵ گردەکاندا خۆیان ئەشارنەوە.
لەو سەروەختەشەوەی کە ئاژاوە کەوتە نێوان تانێ خودای دارستان، تانگارۆوا خودای ئۆقیانووسەکان. تانگارۆوا هەرگیز نەیتوانی براکەی ببەخشێت کە بووبووە هۆی ئەوەی بەشێك لە وەچەکانی لەناو دارستانەکان و مەملەکەتی براکەیدا خۆیان بشارنەوە، لەبەرئەوە کەوتە جەنگێکی ئەبەدی دژ بە تانێ، ئەویش لای خۆیەوە جەنگێکی بەردەوامی دژ بە تانگارۆوا بەرپاکرد.
شەپۆلەکانی ئۆقیانووس جەسورانە و بە مەبەست کەوتنە وێزەی کەنارەکانی نزیك بە مەملەکەتەکەی تانێس بەو ئومێدەی بتوانن دارستانە بە درەخت چنراوەکان لەگەڵ هەرچی باڵدار و مێرو و ئاژەڵەکانی ناویان هەیە کە زەوییەکانی تانگارۆسایان کردبووە جێگای نیشتەجێبوونی خۆیان بکەن بە ژێرەوە و زەوییەکانیان بکەنە ژەمە خۆراك بۆ بوونەوەرە چڵێسەکانی ناو دەریا.
هەندێك جاریش شەپۆلەکانی تانگارۆسا ئەیانتوانی قەیاغە بچووکەکان هەڵوشن کە بە درەختەکانی تانێس دروستکرابوون هەروەها ئەو ماڵ و ڕووبارانەش بخەنە ژێر لافاوەوە کە لە ناو مەملەکەتەکەیدا هەبوون. تانێ پێیوابوو لەناوبردنی زوورەتەکانی تانێس کارێکی باشە، چونکە ڕم و قولاپەکان جێی مەترسی بوون لەسەر دەریاچەکە و نوکی ڕمەکان ئەچەقینە جەستەی نەوەکانی ئەو، هەروەها هەڵدانی ئەو تۆڕانەی کە بە شوڵك و نەمامی تەڕی تانێس چنرابوون نەوەکانی ئەوی پێ ڕاوئەکران.
کاتێك تاواهیری، خودای با و زریان، بەسەر هەردوو براکەیدا تانێ و تانگارۆوادا سەرکەوت و توانی تۆوی ناحەزی لە نێوانیاندا بچێنێت، دوابەدوای ئەوە دەستبەجێ ڕووەو هەرە برا ئاشتیخوازەکانی ڕۆنگۆ ـ ما ـ تانێ، خودای گژ و گیای چاندراو، هاومیا ـ تیکیتیکی، خودای گژ و گیای کێوی ڕۆیشت، بۆئەوەی هەوڵبدات ئازار بەوانیش بگەیەنێت. بەڵام پاپا ـ دایکە خودا ویستی هەرچۆنێك بووە هەردووکیان لەبەر خاتری ئەو سود و کەڵکەی کە هەیانبوو بیانپارێزێت، بۆیە هەردووکیانی زۆر بەباشی شاردەوە تا گەڕانەکانی تاواهیری بەدوایاندا بێ بەرهەمبێت، لە کۆتایدا تاواهیری کۆڵیدا و لە ماندوویدا دەستی لە گەڕان و پشکنین بەدوایاندا هەڵگرت.
تەنیا تو، خودای جەنگ مابووەوە. ئەو هیچ بەلایەوە گرنگ نەبوو تاواهیری چەند بە توڕەییەوە بەسەریدا هەڵئەشاخێت، تو ـ خۆڕاگرانە لەبەردەم هێرشەکانیدا وەستا. هەردوو قاچەکانی لەسەر مەمکەکانی دایکە خودای زەوی چەقاندبوو، بێ لەوە ئەو خۆشی سەردەستەی ناو برا کێوییەکانی بوو. هەر ئەویش بوو کاتی خۆی ویستی دایك و باوکی بکوژێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. دەهریبوونەکەی تاواهیرییش هێدی هێدی خامۆش بووەوە، باکانیش لەگەڵیدا

ئارام بوونەوە و زریانەکانیش شکان، دوای ئەوە ئاشتی و ئارامی کەوتەوە نێوان ئەرز و ئاسمان.

## برا شەڕکەرەکانی تو

دوای تێپەڕبوونی زەمەنێك بەسەر قۆناغی ئاشتیدا، تو ـ دەستیکرد بە بیرکردنەوە لەوەی کە بۆچی کاتی خۆی براکانی لە شەڕی دژ بە تاواهیریدا پشتگیریان نەکرد؟ بۆچی هەموویان ئەویان بەجێهێشت؟ دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی بەم خەیاڵاتانەیەوە ژیا دواتر دەستیکرد بە بیرکردنەوە لە تۆڵەسەندنەوە لە براکانی.

یەکەم کەسێك بەر غەزەبی تو کەوت تانێ بوو. ئەو دڕکێك بوو چەقیبووە چاوی، چونکە نەوەکانی زۆر زوو زیادیانکردبوو، تو ـ ش لەوە ئەترسا ڕۆژێك بێت ببنە دەسەڵاتدار بەسەرییەوە. لەبەرئەوە کەوتە کۆکردنەوەی ڕووەکە هەڵزنەر و ڕیشاڵەییەکان و کردنی بە گوریس، گوریسێك کە دواتر بەکەڵکی هەڵواسین





بێت.

ئەو دەمەی لە هۆنینەوەیان تەواوبوو فێڵزانانە لە کۆمەڵێك شوێنی جیاوازی ناو دارستانەکەدا داوی بۆ نانەوە. منداڵی منداڵەکانی تانێس ئاسان بوون بە داوەکانەوە، دوای ئەوەی نەیانئەتوانی خۆیان لە داوەکان ڕزگاربکەن ئەبوونە ژەمە خۆراکی تو. لەو ڕۆژەوەی ئەوان بوون بە نێچیری دەم داوەکانی تو هەرچی ئارامییەك هەبوو نەیانما.

ئەو برایانەی تری کە لە لیستی تۆڵە لێکردنەوەکەیدا نووسرابوون. تانگارۆوا، خودای ئۆقیانووسەکان بوو. لەبەرئەوەی نەوەکانی سەرقاڵی جرت و فرت و هەڵبەز و دابەز بوون هێندە ڕاوکردنیان زەحمەت نەبوو، چونکە ئەوان هەمیشە لە

ناو و دەرەوەی ئاوەکاندا بێ ترس خەریکی باز بازێن و قریوە قریو بوون. تو ـ تۆڕەکانی بە ئاسانی لە تاڵی کەتان چنیبوو، بەهۆی ئەوانەوە نەوەکانی تانگارۆوای ڕاوئەکرد و لەسەر زەویەکە هەڵی ئەڕشتن و ئەوانیش ئەکەوتنە پەلەقاژێکردن، هەر لەوێشدا لەسەر زەوییەکە ئەیکوڵاندن و ئەیخواردن.

تو ـ کەوتبووە سۆسەکردن و گەڕان بەدوای ڕۆنگۆ و هاومیا دا. ئەگەرچی ئەوان بە کۆمەکی دایکە زەوی خۆیان شاردبووەوە و چووبوونە ناو زێدانی دایکیانەوە. بەڵام هەر زوو تو لە ڕێی چەکەرەکردن و سەوزبوونی گەڵاکانیان و هاتنەدەرەوەیان لەسەر زەوی دۆزینییەوە.

تو ـ بەخۆی و قوڵینگێکی لە درەخت داتاشراو و سەبەتەیەکی لەبەن چنراوەوە ڕۆیشت. بە قوڵنگەکە کەوتە هەڵکەندن و دواتر ڕۆنگۆ و هاومییای دەرهێنا و خستنییە ناو سەبەتەکەیەوە و دەمودەست کەوتەوە ڕێ بۆ ئەوەی بچێت بیانکوڵێنێت و بیانخوات.

لەبەرئەوەی تو ـ شەڕفرۆش بوو توانی بەسەر هەموو براکانیدا سەربکەوێت و وەچەکانیان بخوات. تەنیا تاواهیری، خودای با نەبێت، کە ئەو ئەیتوانی بیبەزێنێت و بیخوات، لەبەرئەوەی کە تاواهیری، دواهەمین منداڵی ڕانگیز و پاپا بوو، لەو ڕۆژەوە بێ هەوارتەکردن بە زریان و بورکانەکانی کەوتۆتە شاڵاوبردن.

لەبەرئەوەی تو سەر بە نەژادی مرۆڤەکان بوو، هەروەها هەموو ئەو خەسڵەتانەی تریشی کە یارمەتیاندا بەسەر براکانیدا سەربکەوێت دواتر بوونە بەشێك لە خەسڵەتەکانی مرۆڤ؛ کە ئەوانیش، نەبەردی و فێڵبازی، دەستڕەنگینی و هێز، بەدخویی و سازشکاری بوون.

هەروەها تو چەند گۆرانییەکی جادوبازانەی داهێنا، کە یارمەتیدەر بوون بۆ مرۆڤەکان بۆئەوەی نێچیری خۆیان لە ڕاوکردن و گرتنی وەچەی براکانی فەراهەم بکەن، بۆئەوەی هەرگیز خەمی شکار و ڕاوی ماسیان نەبێت. هەروەها ئەو گۆرانییە جادوبازانەی تریشی داهێنا، بۆ ئەو کاتانەی مرۆڤەکان ڕوو لە باوکە ئاسمان ئەکەن و داوای کەش و هەوایەکی خۆشی لێ ئەکەن، یان ڕوو لە تاواهیری ئەکەن و داوای هەڵکردنی باکانی لێ ئەکەن، یاخود ئەو کاتەی لە دایکە زەوی ئەپارێنەوە هەموو ئەو نەمامە جۆراوجۆرانەیان بۆ شینبکات کە بەسوودن بۆ مرۆڤەکان.

یەکێکی تر لە گۆرانییە جادووییەکانی کە بۆ زۆر ڕێکەوتی تری ژیانی مرۆڤەکان دەستیئەدا ـ بۆ نموونە کاتێك ناویان لە منداڵەکانیان ئەنا یان ئەو کاتانەی هانی هۆزەکەیان ئەدا لە کاتی جەنگدا، یا بۆ پارێزگاریکردنیان لە نەخۆشی، یاخود وەك دۆعایەك بەکاریان ئەهێنا بۆ بەدەستخستنی سەروەت و سامان یان بۆ هەرچ ڕێکەوتێکی تر کە داوایان لە خوداکان ئەکرد بەتەنگ مرۆڤەکانەوە بێت.

## چۆن ژن لەدایك بوو

ڕۆژێکیان ڕانگی و کوڕەکانی پاپا گفتوگۆیان لەسەر ئەوە ئەکرد کە چیبکەن تا ڕەچەڵەکی مرۆڤ گەشەبکات و چۆنیش بتوانن ئیرا تانگاتا، ژیانی مرۆڤ، خەلق بکەن. لەبەرئەوەی هەموویان نێربوون بڕیاریاندا بەدوای ئوها، ڕەگەزی ژن، لەناو سروشتدا بگەڕێن، تاکو ڕەگەزی پیاو لەگەڵ ڕەگەزی ژندا جوت ببێت و مرۆڤیان لێ بکەوێتەوە.

ئەوەی بەدوای ئوها دا ئەگەڕا تانێ بوو، لەبەر ئەوە لەو دەمی گەڕان و پشکنینەیدا خۆی فێری هونەری جوتبوون کردبوو.

لە ماوەی گەڕانەکەیدا ڕێکەوتی بینینی هینێ ـ ڤاورکی، خانمە چڵوچێوی دارستان کرد، هەر زوو لەگەڵی جووت بوو و دوانەیەکی لێ بوو، بەڵام دوانەکە دوو درەخت بوون، نەك مرۆڤ. تانێ دواتر یەك لەدوای یەك لەگەڵ خانمە چڵوچێوەکاندا خەوت، بەڵام هەرچییەکیانی لێ ئەبوو هەر درەخت و چڵوچێو و بنچکە گیا بوو. کاتێك دواتر لەگەڵ مێروویەکی مێدا جووت بوو ئەویش تەنها مێر و جڕوجانەوەری لێ کەوتەوە، کاتێکیش لەگەڵ باڵدارێکی مێدا جوون بوو هەرچی باڵداری دنیا هەبوو لێ بوو، کاتێکیش لەگەڵ تانێ هینیتوپاریمائونگا، کچی شاخ دا نووست، هەرچی ئاوی کانی بوو ژیانەوە و ڕووبارەکان لەدایکبوون. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا منداڵەکانیان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتریدا بەست و هەرچی گردۆڵکە و بوونەوەری خشۆك هەبوو لەدایکبوون، هەموو جۆرەکانی بەرد و شاخ و چەو و نەرمەڵان هەبوو دروستبوون.

بەڵام هەتا ئەو دەمەش ڕەگەزی ژن نەهاتبووە دنیاوە.

تانێ بێئومێدانە ئاوڕی بۆ لای پاپا ـ تو ـ ئا ـ نوکو، دایکە زەوی دایەوە و لێی پرسی، ئایە ئەو ئەزانێت چۆن و لە کوێ ئوها ڕەگەزی ژن بدۆزێتەوە. دایکە زەوی ڕێنوێنی کرد بچێت بۆ نزیك کەناری کوروواکا، لەوێ لە پاڵ گردی زێدانی دایکە زەوی خۆیدا قوڕێکی سوور هەیە، بەو قوڕە سوورە ئەتوانێت ژنێك بەلاسایکردنەوە لە بەژن و باڵای بوونەوەرە خەلقکراوەکانی خوداکان دروستبکات.

زۆر بە پەلە، تانێ براکانی کۆکردەوە، پێکەوە بەرەوخوار بۆ کەنارەکەی نزیك بە کورووواکا چوون. قوڕە سوورەکەیان لەبەر کونی زێدانی دایکیاندا دۆزییەوە و ژنێکیان لێ دروست کرد، کە هەر لە خۆیان ئەچوو. بۆ ئەوەی ئەو بوونەوەرە ببێت بە ژن هەر یەك لە برا خوداکان ئەندامێك یان لەتێك لە جەستەی خۆی پێبەخشی؛ ڕاهوو بەشە گەورەکەی

زێدانی بۆ دروستکرد و ڤێراڤێراش پچکۆلەییەکەی، لەکاتێکدا تاواهیری خودای باکانیش، مەمکەکانی بۆ نەخشاند. تانێ پێی وتن کە ئەو ژیانی پێ ئەبەخشێت. بە ورياييەوە بەسەر هیناهونێ، ژنە قوڕینەکەدا نوشتايەوە، لە یەك کاتدا هەم باوەشی پیاداکرد و هەمیش بە ورياييەوە فووی کرد بە کونی لوتیدا. ژنە ـ قوڕینەکە دەستی بەهەناسەدان کرد، دەمودەستیش پژمی و دوای ئەوە ڕۆحی بەبەردا برا. بەوجۆرە ئیرا تانگاتا، ژیانی مرۆڤ، دروستبوو.

لە ڕاستیدا تانێ و براکانی بوون کە یەکەم ژنیان دروستکرد و ئەو پارچانەی جەستەیان بۆ فەراهەمکرد کە کردی بەو ژنەی ئێستا هەیە، ئەوان نەیان ئەزانی ئەبێت چۆن لەگەڵی جووت ببن بۆ ئەوەی زوورەتی لێ بخەنەوە. تانێ هەوڵیدا یەك بە یەك ئەندامەکانی ژنەکە بەکاربهێنێت، بەڵام سەرباری ئەوەش هیچ منداڵێك لەدایك نەبوو. هەموو شێوازێکی تاقیکردەوە ـ کاتیك کردی بە کونی گوێچکەیدا مۆمی لێ هاتە دەرەوە، کردی بە بن باڵیدا ئارەقەی لێ چۆڕایە خوارەوە، کردی بە دەمیدا لیکی لێ ڕژا، کردی بە قونیا پیسایی هاتە دەرەوە.

بەڵام لە کۆتایدا زانی کە چۆن ئەبێت ئەندامی نێرینەی لە ئەندامی مێینەی نزیك بکاتەوە، کاتێکیش لە کۆتایدا هەردووکیان زانیان چۆن جەستەیان بە شێوەیەکی دروست بەیەکترییەوە ئەنووسێنن دواتر ئەوەندەی نەخایاند هینێتیتاما، کچی بەرەبەیان، لەدایك بوو، ئەو کچەی کە لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەندا بوو بە دایکی نەوەکان.

## کچی بەرەبەیان و مردن

هینێتیتاما، کچی بەرەبەیان، کچی تانێ، ئەوەی لە قوڕ دروستکرابوو، یەکەم ژن، هەروەها ئەو یەکەم مرۆڤە ڕاستەقینەیەی سەر زەوی، بەرهەمی ئەو سەرکەوتنەی نێوان یەکێك لە خوداکان و زەوی خۆیدا بوو. تانێ تەنانەت لەگەڵ کچەکەی خۆشیدا جووت بوو بۆ ئەوەی منداڵی زۆری ببێت و مرۆڤەکان بتوانن پەرە بە ژیان و دواڕۆژێکی ئارام بدەن. کاتێك کچی بەرەبەیان یەکەم کچی هێنایە دونیاوە لە تانێی پرسی کێ باوکی ڕاستەقینەی ئەم منداڵەیە. ویستی خۆی لە وەڵامی ئەم پرسیارە بدزێتەوە، بەڵام کاتێك زۆری بۆ هێنا وەڵامی دایەوە و پێیوت:

ـ باشترە ئەم پرسیارە لە قاپییەوانەکەی ژێر زەوی بکەیت.

هینێتیتام بەتەنیا لەگەڵ ئەو حەقیقەتە تاڵەدا ژیا ـ تانێ تەنها مێرد یان باوکی منداڵەکەی نەبوو، بەڵکە باوکی ڕاستەقینەشی بوو! دوای زانینی ئەو راستییە دەمودەست بە شەرمەزارییەکی زۆر و نائومێدییەکی گەورەوە تانێی

بەجێهێشت و چوو بۆ لای ڕاروهێنگا، ژێر زەوی.
کاتێك گەیشتە بەردەم قاپییەکە پاسەوانێکی بینی، پێیوت کە ئەمە دواهەمین جار ئەبێت چاوی بە تا ئاو، ڕووناکی دنیا، بکەوێت، لەویادا تێگەیشت کە ئەبێت بۆ ئەبەد ئەوی بەجێبهێڵێت. کاتێك سەیری دەوروبەر خۆی کرد چاوی بە تانێ، پیاوەکەی، کەوت کە تا ئەوێ بەدوایدا هاتبوو و لە جێگای خۆیدا لەسەر زەوییەکە ڕاکشابوو بە غەمبارییەوە بۆ ماڵئاوایی ئەو ئەگریا. بەڵام کچی بەرەبەیان سووربوو لەسەر بەجێهێشتنی، هاواری لێکرد و پێی وت:
ـ تانێ، بگەڕێرەوە بۆ ماڵەوە و ئاگات لە منداڵەکانمان بێت و ژیانێکی باشیان بۆ فەراهەم بکە! ئەو ڕۆژەشی کە ئەمرن دێنەوە لای من و ئەوکات من ئاگام لێیان ئەبێت!
بەدەم ئەم قسانەوە هەنگاوی بەرەو قاپییەکەی ژێر زەوی هەڵهێنا و بوو بە هینێ ـ نوی ـ تێ ـ پۆ، هەرە دەسەڵاتدارترین سوارچاکی ناو مەملەکەتی مردن.
ئەو ڕێگایەی کچی بەرەبەیان بەرەو ڕاڕۆهێنگا بڕی هەمان ئەو ڕێگایەیە کە هەموو مرۆڤێك لە ڕۆژێکی خۆشدا ئەبێت بیبڕێت ـ هەمووان، هەر هەمووومان، بێ هیچ ئاوارتەیەك.

کاتێك خوداکان دایکە زەوی سەرەو ژێر ئەکەن
ئەو عەشقە زۆرەی لە نێوان باوکە ئاسمان و دایکە زەویدا دروستبووبوو هی ئەو قۆناغە زۆرە بێ سنوورە بوو کە پێکەوە نووسابوون و لە ئامیزی یەکتریدا گەورە بووبوون، سەرباری دڵڕەقی منداڵەکانیان لەگەڵیاندا و لەیەکتری ترازاندنیان ئەوان هیشتا هەر یەکتریان خۆش ئەویست. باوکە ئاسمان بێ سنوور فرمێسکی ڕشت لە حەسرەت ئەوەی کە چیتر دایکە زەوی لە ئامیزیدا نییە، ئەو هەموو بارانە بێ پسانەوەیە کە ڕشتی وایکرد زەمین بکەوێتە ژێر لافاوەوە و مەترسی ئەوە دروست ببێت هەرچی بوونەوەر هەیە شەپۆلی ڕووبارەکان لەگەڵ خۆیان ببەن. کاتێك خوداکان تێگەیشتن چییان کردووە کەوتنە ڕاوێژکردن و بڕیاریاندا دایکە زەوی ژێرە و ژوور بکەن، بۆئەوەی چیتر باوکە زەوی نەبینێت کە لەتاو لەیەکترازانیان چی لێهاتووە، هەروەها بۆ ئەوەی چیتر بەردەوام ئازار نەچێژێت لە تاو دووری ئامێزی ئەو. لەو ڕۆژەوە چیتر باوکە ئاسمان هێندە نەگریا، بەڵام کاتێك مرۆڤەکان ئەو فرمێسکانەیان بینی کە شەوانە باوکە ئاسمان لە تاو تەنهایی خۆی هەڵی ئەڕشتن و ئەتکانە سەر پشتی دایکە زەوی، ناویان نا باران.
بەڵام ئەو تەمە شێدارەی کە هەموو بەیانییەك لە دەشتەکان هەڵئەستا و دواتر بەرز ئەبوەوە بۆ ئاسمان، ئەو ئاهە

نەرم و هەناسە گەرمانەی دایکە زەوی بوون کە لە غەریبیکردنی باوکە ئاسماندا هەڵی ئەکێشان.

ئەڵێن کاتێك براکان دایکە زەویان ژێرە و ژوور کردووە هێشتا هەر خەریکی شیردان بووە بە دواهەمین منداڵی خۆی، ڕواومۆکۆ. کوڕەکانی بڕیاریانداوە ئەو منداڵە لەسەر سنگی دایکیان بهێڵنەوە، لەو ڕۆژەوە ئەو منداڵە کەوتۆتە ژێر دایکییەوە. بەڵام بۆ ئەوەی ڕەق نەبێتەوە براکان ئاگریان بۆ فەراهەم کردووە تا خۆی پێ گەرم بکاتەوە، ئەوەش ئەو ئاگرەیە کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێت ئاهی ـ کۆ ـ ماو، کە ئەویش پشکۆی تواوەی بورکانەکانە. ڕواومۆکۆ لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەندا بوو بە خودای بومەلەرزە، ئاهی ـ کۆ ـ ماو و ڕواومۆکۆ، بەهەردوکیان زەوی وڵاتەکەمان ئەلەرزێنن.

سەرچاوە:

**Folk Sagor**

**Gudar och m□nniskor**

**Bra B□cker**